# شەرحی

# مقدمة أصول التفسير

نوسینی شێخی ئیسلام
ئیبن تەیمییە رحمە اللە

ئامادەکردنی
عوسمان ئەحمەد حاتەم

چاپی یەکەم



# شەرحی

# مقدمة أصول التفسير

نوسینی شێخی ئیسلام

**ئیبن تەیمییە رحمه الله**

ئامادەکردنی

**عوسمان ئەحمەد حاتەم**

چاپی یەکەم

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خوای دروستکاری هەموو جیهان، درود و سەلام لەسەر پێغەمبەری پێشەوا و سەرمەشق و ڕابەرمان.

ئەم کتێبە (شەرحی مقدمە أصول التفسير) تێیدا دەقی کتێبەکەی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییەم رحمه الله وەرگێڕاوە و لێکدانەوە و ڕاڤەم بۆ هەندێك لە بڕگەکانی کردووە.

زانراوە هەموو زانستێك کۆمەڵێك بنەمای هەیە، زانستی تەفسیری قورئان کە فەرموودەی خوای گەورەیە یەکێکە لەو زانستانەی زانایان کۆمەڵێك ڕێسا و بنەمایان بۆ ئاسان تێگەیشتن لە قورئان داناوە، پێویستە ئەو کەسەی خەریکی لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی قورئان دەبێت شارەزایی هەبێت لەو بنەمایانە و بەوشێوەیە ڕەچاویان بکات کە زانایانی سەلەف دایانڕشتووە، و سنوریان بۆ دیاری کردووە.

بۆ نموونە زانستی (ناسخ و مەنسوخ) یارمەتیدەرێکی زۆرباشە بۆ تێگەیشتن لە مانای فەرموودەی خوای پەروەردگار، هەروەها زانستی نەحو و فقه و ئوصولی فقه گرنگن بۆ هەڵێنجانی ئەو حوکمە شەرعییانەی کە ئایەتەکان لە خۆیان گرتووە.

بەشێوەیەکی گشتی ئەو کەسەی تەفسیری قورئان دەکات دەبێت ئاگای لە زانستە شەرعییەکان بێت، چونکە هەریەکەیان بەشێوەیە لە شێوەکان پەیوەندییان بە قورئان و

ماناکردنییەوە هەیە، چونکە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرچاوەی شەریعەتی ئیسلامن.

وەك شێخی ئیسلام لە بنەماکانیدا ئاماژەی پێکردووە دەبێت قورئان بە قورئان و سوننەت و بۆچوونی هاوەڵان و زانایانی پێشین تەفسیر بکرێت، هەروەها ئەگەر دوو هۆکاری دابەزینی ئایەتێك باسکرابوو هەردوو هۆکارەکە هۆکاری دابەزینی ئایەتەکەن ئەگەر دژیەك نەبوون، ئەمانە و چەندان بنەمای تر لە دوو توێی ئەم کتێبەدا هاتووە، بەو هیوایەی سود بە خوێنەرانی بگەیەنێت.

عوسمان ئەحمەد حاتەم

گەرمیان — کەلار

٨ ـ جمادى الأولى ـ ١٤٤٥

٢٠٢٣ـ١١ـ٢٢

(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيْمِ)

واتە: بە ناوی خوای میهرەبانی بە بەزەیی.

بەناوی خوای میهرەبانەوە دەست پێکردن سوننەتە، چونکە پێغەمبەر سلیمان عليه السلام کاتێك نامەی بۆ پاشا ژنەکەی سەبە نارد نوسی: ﴿إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣٠﴾(النَّمْل).

واتە: بێگومان ئەم نامەیە لە سولەیمانەوەیە، بە ناوی خوای میهرەبانی بە بەزەییەوە دەست پێدەکات.

قورئانی پیرۆز بە بسم الله دەستی پێکردووە، هەروەها بە چاولێکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە کاتێك نوسراوی بۆ پاشاکان و کەسانی دیکەش ناردبا بە بسم الله دەستی پێدەکرد، ئەوەش لە هەردوو صەحیحەکە لە نوسینی نامەکەی هیرەقل و ڕێکەوتنامەی حودەیبییە و جگە لەوانەش هاتووە: ((بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مِنْ مُحَمَّدٍ عَبْدِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ)).

واتە: بە ناوی خوای میهرەبانی بە بەزەییەوە لە محمدی بەندە و پێغەمبەری خوا بۆ هیرەقلی گەورەی ڕۆمەکان.

بەڵام پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکرێت نوسینی ناوی خوا و ئایەتی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر پەڕە و کاغەزێك نەنوسرێتەوە پاشان فڕێ

بدرێت و ژێرپێ بکەوێت، چونکە ئەوە شایان نییە بە ناوی پیرۆزی خوا ﷻ و ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و ناو و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

(رَبِّ يَسِّرْ وأعِنْ بِرَحْمَتِكَ)

واتە: پەروەردگارا ئاسنکاریم بۆ بکە و یارمەتیم بدە بە بەزەیی خۆت.

(الْحَمْدُ لِلَّهِ نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاَللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ صَلّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَسْلِيمًا).

واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوا پشتی پێ دەبەستین و داوای لێ خۆشبوون و پۆشینی تاوانەکانمان دەکەین، و پەنای پێدەگرین لە شەڕی نەفسمان و کردەوە خراپەکانمان، هەرکەسێك خوا هیدایەتی بدات کەس ناتوانێت گومڕای بکات، هەرکەسێك خوا گومڕای بکات کەس ناتوانێت هیدایەتی بدات، گەواهیدەدەم کە هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق شایانی پەرستن بێت جگە لە خوای تاك و تەنها و هیچ هاوبەشی نییە، و گەواهیدەدەم کە محمد بەندە و پێغەمبەری خوایە درود و سەلامی خوای لەسەر بێت.

شێخی ئیسلام بەم چەند وشەیە دەستی بە نوسینەکەی کردووە، ئەم پێشەکییە پێی دەگوترێت (خطبة الحاجة) ئەلبانی بە سوننەتی داناوە گوتار و نوسین بە (خطبة الحاجة)

دەست پیێ بکرێت، لە کتێبی (خطبة الحاجة التي كان رسول الله ﷺ يعلمها أصحابه)، بە بەڵگەی ئەوەی ئیبن مەسعود رضي الله عنه دەڵێت: ((علَّمنا رسولُ اللهِ ﷺ خُطبةَ الحاجةِ في النكاحِ وغيرِه: الحمدُ للهِ...))(١).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ (خطبة الحاجة) لە مارەبڕین و جگە لەوەش فێریکردین: الحمد لله...

دەبینین: ((نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاَللَّهِ)) بە شێوازی کۆ هەموو ئەو لەفزانە هاتووە، بەڵام لەفزی هەردوو شەهادەکە: ((أَشْهَدُ أَنْ لَا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)) بە تاك هاتووە، شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە دەڵێت: لەبەر ئەوەی شایەتیدان کەس ناتوانێت شەهادەت بۆ کەس بدات، و بریکاریش تێیدا قەبوڵ ناکرێت، بەڵام داوای یارمەتیکردن و پەناگرتن و داوای لێخۆشبوون قەبوڵ دەکرێت، کەسێك دەتوانێت داوای لێخۆشبوون لە خوا بۆ خۆی و کەسانی تریش بکات، هەروەها داوای یارمەتی و پەناپێگرتن دەتوانێت بە کۆ بیانهێنێت(٢).

(أَمَّا بَعْدُ:)

واتە: دوای ئەوە.

(١). أخرجه أبوداود وصححه الألباني.
(٢). (تهذيب السنن)(٣/٥٤).

ئەم وشەیە بەکاردەهێنرێت بۆ گواستنەوە لە شێوازێکەوە بۆ شێوازێکی تر، و گواستنەوە لە پێشەکییەوە بۆ ناوەڕۆك، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم وشەیەی بەکارهێناوە، میسوەری کوڕی مەخرەمە رضي الله عنه دەڵێت: ((قامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَسَمِعْتُهُ حِينَ تَشَهَّدَ يَقُولُ: أمّا بَعْدُ))(١).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا گوێم لێ بوو کاتێك شایەتمانی دەهێنا دەیفەرموو: (أمّا بَعْدُ).

و ئیبن عەباس رضي الله عنهما باسی ئەو نامەیە دەکات پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هیرەقلی پادشای ڕۆمی ناردووە و ئەبوسوفیان رضي الله عنه باسەکەی بۆی گێڕاوەتەوە، تێیدا هاتووە: ((بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مِن مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ إلى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ، سَلاَمٌ عَلى مَنِ اتَّبَعَ الهُدى، أمّا بَعْدُ: فَإنِّي أدْعُوكَ بِدِعايَةِ الإسْلاَمِ، أسْلِمْ تَسْلَمْ، وأسْلِمْ يُؤْتِكَ اللَّهُ أجْرَكَ مَرَّتَيْنِ، فَإنْ تَوَلَّيْتَ فَإنَّ عَلَيْكَ إثْمَ الأرِيسِيِّينَ)).

واتە: بە ناوی خوای میهرەبانی بە بەزەییەوە، لە محمدی پێغەمبەری خواوە بۆ هیرەقلی گەورەی ڕۆم، سەلام لە هەرکەسێك کە شوێنی هیدایەتی خوا دەکەوێت، أما بعد: من بانگەوازت دەکەم بە بانگەوازی ئیسلام، موسڵمان بە سەلامەت دەبیت، موسڵمان بە خوا دوو جار پاداشتت دەداتەوە، بەڵام ئەگەر پشت هەڵبکەیت و باوەڕ نەهێنیت، دڵنیابە تاوانی هەموو جووتیارەکان کە شوێنتکەوتوون لە ئەستۆتە.

(١). أخرجه البخاري ومسلم.

و هیشامی کوڕی عوروه دەڵێت: ((رأيْتُ رَسائلَ مِن رسائلِ النَّبيِّ ﷺ، كلَّما انقضَتْ قِصَّةٌ قال: أمّا بَعْدُ))[١].

واتە: هەندێك لە نامەکانی پێغەمبەری خوام ﷺ بینی، هەرکاتێك باسێك بە کۆتا هاتبا فەرمووی: أمّا بَعْدُ.

بوخاری بابەتێکی لە صەحیحەکەیدا هێناوە لە ژێر ناوی: (بابُ مَن قالَ فِي الخُطْبَةِ بَعْدَ الثَّناءِ: أمّا بَعْدُ)، ئەو فەرموودانە بەڵگەی ئەوەیان تێدایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ گوتار و نوسینیش ئەو وشەیەی بەکارهێناوە، و بەکارهێنانی سوننەتە.

(فَقَدْ سَأَلَنِي بَعْضُ الْإِخْوَانِ أَنْ أَكْتُبَ لَهُ مُقَدِّمَةً تَتَضَمَّنُ قَوَاعِدَ كُلِّيَّةً تُعِينُ عَلَي فَهْمِ الْقُرْآنِ، وَمَعْرِفَةِ تَفْسِيرِهِ وَمَعَانِيه وَالتَّمْيِيزِ فِي مَنْقُولِ ذَلِكَ وَمَعْقُولِهِ بَيْنَ الْحَقِّ وَأَنْوَاعِ الْأَبَاطِيلِ وَالتَّنْبِيهِ عَلَي الدَّلِيلِ الْفَاصِلِ بَيْنَ الْأَقَاوِيلِ؛ فَإِنَّ الْكُتُبَ الْمُصَنَّفَةَ فِي التَّفْسِيرِ مَشْحُونَةٌ بِالْغَثِّ وَالسَّمِينِ وَالْبَاطِلِ الْوَاضِحِ وَالْحَقِّ الْمُبِينِ).

واتە: هەندێك برا پرسیاریان لێکردم و داوایانکرد پێشەکییەکیان بۆ بنووسم، کۆمەڵە یاسایەکی گشتی لەخۆ بگرێت یارمەتیدەر بێت بۆ تێگەیشتن لە قورئان و زانینی ڕاڤە و تەفسیر و ماناکانی و جیاکردنەوەی ئەو تەفسیرانەی بە ئەسەر تەفسیرکراوە لەو تەفسیرانەی بە ڕەئی و بۆچوون تەفسیرکراوە، کامیان حەق و کامیان لە جۆرە باتڵەکانە، و وریاییدان لە بەڵگەی یەکلاکەرەوە لە نێوان بۆچوونەکان، چونکە

(١). أخرجه ابن أبي شيبة والبخاري في (الأدب المفرد)، وقال الألباني: صحيح لغيره.

بەدڵنیاییەوە ئەو کتێبانەی دەربارەی تەفسیری قورئان نوسراون ئاخێنراون لە شتی باش و خراپ، و باتڵی ئاشکرا و حەقی ڕوون.

لەم بڕگەیەدا شێخی ئیسلام باسی ئەوە دەکات پرسیاری لێکراوە پێشەکییەکیان بۆ بنووسێت کۆمەڵە یاسایەکی گشتی لەخۆ بگرێت یارمەتیدەربێت بۆ تێگەیشتن لە مانا و مەبەستەکانی قورئانی پیرۆز و جیاکردنەوەی بۆچوونە باشەکان لە خراپەکان و بەڵگەی صەحیحی لە بەڵگە لاوازەکان، ئیبن عوسەیمین دەڵێت: بەڵگەی عەقڵی ئیعتباری هەیە لە تەفسیری قورئاندا ئەگەر پێچەوانەی بەڵگەکان نەبێت، و گومانی تێدا نییە بەشێکی باشی هەیە لە تێگەیشتنی قورئان، لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرمانمان پێدەکات لە زۆر ئایەت لە قورئانی پیرۆز بیر بکەینەوە و تێبفکرین، بەڵکو تێگەیشتن لەو ئایەتەی دەفەرموێت: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢٩﴾(ص)، واتە: ئەم کتێبە پیرۆزە کە قورئانە و پڕ بەرەکەت و چاکەیە بە وەحی بۆمان دابەزاندوویت ئەی پێغەمبەری خوا، بۆ ئەوەی خاوەن عەقڵ و بیرمەندەکان بیر لە ئایەت و بەڵگەکانی بکەنەوە و تێیان بفکرن و پەند و ئامۆژگارییان لێوەربگرن و کرداریان پێبکەن[1].

(١). (شرح مقدمة أصول التفسير)(٧).

ئایا شێخی ئیسلام خۆی ناوی (مُقَدِّمَةٌ فِي أُصُولِ التَفسِيرِ) لەم نوسراوە ناوە یان لەم پێشەکییەوە دەریان هێناوە، ئەوەی دیارە شێخی ئیسلام خۆی ئەو ناوەی لێنەناوە، بەڵکو هەندێکیان دەڵێن: (محمد جمیل الشطي)(١٣٠٠–١٣٧٨) ئەو ناوەی لێناوە.

لەم پێشەکییەدا شێخی ئیسلام ئاگاداری ئەوە دەداتە خوێنەران کە کتێبەکانی تەفسیری باش و خراپییان تێدایە پێویستە بە وریاییەوە بخوێنرێنەوە، دەبێت ئەو سەرچاوانە بخوێنرێتەوە کە نوسەرەکانی بیروباوەڕ و مەنهەجیان سەلامەتە، ئەگەر لەلایەن زانایەکی لێکۆڵەرەوە فەرموودە و ئەسەرەکانی لێکۆڵینەوەیان لەسەر کرابێت باشترە، نابێت مرۆڤ بەتایبەت ئەگەر پێشەکییەکی نەبێت لە زانستی شەرعی هەموو شتێك بخوێنێتەوە، چونکە دەشێت گومانێك بچێتە دڵییەوە، سوفیانی سەوری دەڵێت: هەرکەسێك بیدعەیەکی بیست بۆ ئەو کەسانەی نەگێڕێتەوە لەگەڵیدا دادەنیشن و نەیخاتە دڵیانەوە، زەهەبی لەسەر ئەم قسەیە دەڵێت: زۆربەی پێشەواکانی سەلەف لەسەر ئەم وریاییدانە وادەبینن دڵەکان لاوازن، و شوبهە و گومانەکان دڵ دەڕفێنن[(١)].

(وَالْعِلْمُ إِمَّا نَقْلٌ مُصَدَّقٌ عَنْ مَعْصُومٍ وَإِمَّا قَوْلٌ عَلَيْهِ دَلِيلٌ مَعْلُومٌ وَمَا سِوَى هَذَا فَإِمَّا مُزَيَّفٌ مَرْدُودٌ وَإِمَّا مَوْقُوفٌ لَا يُعْلَمُ أَنَّهُ بَهْرَجٌ وَلَا مَنْقُودٌ).

واتە: زانست ئەوەیە لە ئایەتێکدا هاتووە یان ڕیوایەتکراوە و پشتڕاستکراوەتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، یان بۆچوونێکە بەڵگەی زانراوی لەسەرە، جگە لەمانە یان ساختە و ڕەتکراوەیە، یان ڕادەوەستیت و نازانرێت خراپە یان ڕەخنە لێگیراوە.

---

(١). (سير أعلام النبلاء)(٧/٢٦١).

لەم بڕگەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت زانست چوار بەشە:

یەکەم: زانست ئایەتێکە لە شوێنێك بەشێوەیە گشتی باسکراوە لە شوێنێکی تر تایبەتکراوە، یان بەڕەهایی باسکراوە لە ئایەتێکی وابەستەکراوە، یان بەکورتی باسکراوە لە شوێنێکی تر بە درێژی ڕوونکراوەتەوە، هەموو ئەوانە بۆ سوننەتی صەحیحی پێغەمبەری خواش ﷺ ڕاستە، هەروەها ئەگەر زانایان کۆڕا بوون لەسەر حوکمێك لە ڕیزبەندی ئەم بەشەدا جێگای دەبێتەوە، چونکە کەعبی کوڕی عاصمی ئەشعەری رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إنّ اللهَ قد أجار أُمَّتي من أنْ تجتمِعَ على ضلالةٍ))[1].

واتە: بێگومان خوای گەورە ئوممەتەکەمی پاراستووە لەوەی لەسەر گومڕایی کۆ ببنەوە.

دووەم: بۆچوون و ئیجتهادی زانایەکە پاڵپشت بە بەڵگەیەك ئیجتهادی کردووە و دژ نییە لەگەڵ بەڵگە صەحیحەکان.

سێیەم: ڕەئی و بۆچوونی خراپ کە دژە لەگەڵ بەڵگەکان، هەموو بیروباوەڕێکی خراپ و بیدعە و شتە داهێنراوەکان و هەموو ڕەئێکی شاز و خراپ لە ژێر ئەم بابەتەدا جێگای دەبێتەوە.

چوارەم: شتێك نەزانرێت هەڵەیە یان ڕاستە، زانایان لەم بەشە بەتایبەت لە تەفسیری قورئاندا ئەو ئیسرائیلییاتانەیان داناوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ پشتڕاستی

---

(١). أخرجه ابن أبي عاصم في (السنة)(١/٢)، وحسنه الألباني في (الصحيحة)(١٣٣١).

نەکردووەتەوە، هەروەها نەسەلماوە ڕەتی کردبێتەوە، و دژ نەبێت لەگەڵ مانا و مەبەستێك لە شەریعەتی ئیسلام، ئەم جۆرەیان دەبێت بوەستین نەپشتڕاستی بکەینەوە و نەڕەتیشی بکەینەوە بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی عبداللەی کوڕی عەمر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((بَلِّغُوا عَنِّي ولَوْ آيَةً، وحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إسْرائِيلَ ولاَ حَرَجَ، ومَن كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النّارِ))[١].

واتە: لە منەوە بیگەیەنن ئەگەر ئایەتێکیش بێت، و لە نەوەکانی ئیسرائیلەوە بگێڕنەوە تاوانتان ناگات و بەبێ ئیحراج، و هەرکەسێك بە ئەنقەست درۆ بۆ من هەڵببەستێت، شوێن و جێگایەك لە ئاگری دۆزەخدا بۆ خۆی بگرێت.

هەندێك لە زانایان ئەو دابەشکاریەیان کردووەتە سێ بەشەوە، بەڵگەیەك لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، یان ئیجتهاد و تێگەیشتنی زانایەك لە بەڵگەیەك، و شتێك کە نەزانرێت بەڵگەیە صەحیحی لەسەرە لەوەدا وەستان دەکرێت.

(وَحَاجَةُ الْأُمَّةِ مَاسَّةٌ إلَى فَهْمِ الْقُرْآنِ الَّذِي هُوَ حَبْلُ اللَّهِ الْمَتِينُ وَالذِّكْرُ الْحَكِيمُ وَالصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ الَّذِي لَا تَزِيغُ بِهِ الْأَهْوَاءُ وَلَا تَلْتَبِسُ بِهِ الْأَلْسُنُ وَلَا يَخْلَقُ عَنْ كَثْرَةِ التَّرْدِيدِ وَلَا تَنْقَضِي عَجَائِبُهُ وَلَا يَشْبَعُ مِنْهُ الْعُلَمَاءُ مَنْ قَالَ بِهِ صَدَقَ وَمَنْ عَمِلَ بِهِ أُجِرَ وَمَنْ حَكَمَ بِهِ عَدَلَ وَمَنْ دَعَا إلَيْهِ هُدِيَ إلَي صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ وَمَنْ تَرَكَهُ مِنْ جَبَّارٍ قَصَمَهُ اللَّهُ وَمَنْ ابْتَغَي الْهُدَي فِي غَيْرِهِ أَضَلَّهُ

(١). أخرجه البخاري(٣٤٦١).

اللَّهُ[(١)]؛ قالَ تَعالَى: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا
يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ
﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِيٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا
فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾﴾(طه).

**واته: ئوممەتی ئیسلام زۆر پێویستی بە تێگەیشتنی قورئانە، کە پەتی پتەوی خوایە، و یاد و زیکری داناییە، و ڕێگای ڕاستە، و حەز و ئارەزووەکانی خەڵك ناتوانن لایبدەن، و زمانەکانی تر ناتوانن هاوشێوەیبن و تێکەڵی ببن، زۆر خوێندنەوە نابێتە هۆکاری بێزاری و کۆن نابێت، حوکم و فەرمانە سەرسوڕهێنەرەکانی کۆتاییان پێنایەت، زاناکان تێری**

(١). ئەلبانی بەم لەفزە: ((أتاني جبريل فقال: يا محمد! إن أمتك مختلفة بعدك، قال: فقلت له: فأين المخرج يا جبريل؟ قال: فقال: كتاب الله تعالى، به يقصم الله كل جبار، من اعتصم به نجا، ومن تركه هلك، مرتين، قول فصل، وليس بالهزل، لا تختلقه الألسن، ولا تفنى أعاجيبه، فيه نبأ ما كان قبلكم، وفصل ما بينكم، وخبر ما هو كائن بعدكم)) لە (الضعيفة)دا هێناویەتی بە ژمارە (١٧٧٦) دەڵێت: ئەحمەد (١٩/١) ڕیوایەتی کردووە: ضعيف جدا؛ بەڵام شێخی ئیسلام وەك فەرمووده نەیهێناوە.

و بەم لەفزە: ((قَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: ألا إنَّها سَتَكُونُ فِتْنَةٌ؛ فَقُلْتُ: ما المَخْرَجُ مِنها يا رَسُولَ اللَّهِ؟ قالَ: كِتابُ اللَّهِ فِيهِ نَبَأُ ما قَبْلَكُمْ وخَبَرُ ما بَعْدَكُمْ، وحُكْمُ ما بَيْنَكُمْ، وهُوَ الفَصْلُ لَيْسَ بِالهَزْلِ، مَن تَرَكَهُ مِن جَبّارٍ قَصَمَهُ اللَّهُ، ومَن ابْتَغى الهُدى فِي غَيْرِهِ أضَلَّهُ اللَّهُ، وهُوَ حَبْلُ اللَّهِ المَتِينُ، وهُوَ الذِّكْرُ الحَكِيمُ، وهُوَ الصِّراطُ المُسْتَقِيمُ، هُوَ الَّذِي لا تَزِيغُ بِهِ الأهْواءُ، ولا تَلْتَبِسُ بِهِ الألْسِنَةُ، ولا يَشْبَعُ مِنهُ العُلَماءُ، ولا يَخْلَقُ عَلى كَثْرَةِ الرَّدِّ، ولا تَنْقَضِي عَجائِبُهُ، هُوَ الَّذِي لَمْ تَنْتَهِ الجِنُّ إذْ سَمِعَتْهُ حَتّى قالُوا: ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِيٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ ﴿٢﴾﴾(الجنّ)، مَن قالَ بِهِ صَدَقَ، ومَن عَمِلَ بِهِ أُجِرَ، ومَن حَكَمَ بِهِ عَدَلَ، ومَن دَعا إلَيْهِ هَدى إلى صِراطٍ مُسْتَقِيمٍ)) لە سوننەی ترمزی بە ژمارە (٢٩٠٦) لە عەلییەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە، و ئەلبانی دەڵێت: زەعیفە.

لێناخۆن، هەرکەسێك بەڵگە بە قورئان بهێنێتەوە ڕاستی گوتووە، هەرکەسێك کردەوەی پێ بکات پاداشت وەردەگرێت، هەرکەسێك حوکمی پێبکات دادگەر دەبێت، و هەرکەسێك بانگەواز بکرێت بۆ قورئان هیدایەتدراوە بۆ ڕێگای ڕاست، هەرکەسێکی دەسەڵاتدار و زۆردار پشتی تێ بکات خوا لە دونیا یان لە قیامەت سزای سەختی دەدات، و هەرکەسێك بە دوای هیدایەتدا جگە لە قورئان بگەڕێت خوا گومڕای دەکات.

خوا ﷻ دەفەرموێت: کاتێك هیدایەتی منتان بۆ هات هەرکەسێك شوێنی هیدایەتی من بکەوێت لە دونیا گومڕا نابێت، لە قیامەتیشدا دوچاری سزا و ناڕەحەتی نابێت، هەرکەسێك پشت لە هیدایەت و ئامۆژگاری من بکات، ئەوا بێگومان ژیانی سەخت و دژوارە، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری دەیهێنین بۆ لێپرسینەوە و هیچ بیانوو و بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نییە، دەڵێت: پەروەردگارا بۆچی بە کوێری منت هێناوە بۆ لێپرسینەوە، لە کاتێکدا من لە دونیا بینابووم؟، خوا پێی دەفەرموێت: چونکە ئایاتەکانی ئێمەت بۆ هات لەبیر و فەرامۆشتکردن، بەوشێوەیە ئەمڕۆ تۆ فەرامۆش دەکرێیت و لە ئاگری دۆزەخدا وازت لێ دەهێنرێت.

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ۝١٥ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ۝١٦﴾ (المَائِدَة).

واتە: لە خواوە ڕووناکی و کتێبی ئاشکراتان بۆ هاتووە کە قورئانە، خوا بەو کتێبە هیدایەتی کەسانێك دەدات کە شوێنی ڕەزامەندی کەوتوون بۆ ڕێگاکانی بەدەست

هێنانی ئاشتی و بەختەوەری، لە تاریکییەکان و گومڕاییەکان دەریان دەهێنێت بۆ ڕووناکی ئیسلام بە ڕوخسەت و ویستی خۆی، و هیدایەت وڕێنماییان دەکات بۆ ڕێگای ڕاست .

و دەفەرموێت: ﴿الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ۝١ ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَوَيۡلٞ لِّلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٖ شَدِيدٍ ۝٢﴾(إِبۡرَاهِيم).

واتە: بە (أَلِفْ، لامْ، را) دەخوێندرێتەوە، ئەم قورئانە کتێبێکە بۆمان دابەزاندوویت بۆ ئەوەی خەڵك لە تاریکییەکانی بێباوەڕی و هاوبەش بڕیاردانەوە دەربهێنیت بۆ ڕووناکی باوەڕ و بەتەنها پەرستنی خوا، بەویستی پەروەردگاریان بۆ ڕێگای ڕووناکی کە ڕێگای خوای باڵادەستی بەدەسەڵاتە و سوپاسکراوە لەسەر نیعمەتەکانی، خوایە کە هەموو ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە موڵکی ئەون، فەوتان و بە هیلاکداچوون بۆ بێباوەڕانە بە سزای توندی خوا .

و دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلۡنَٰهُ نُورٗا نَّهۡدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنۡ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ۝٥٢ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلۡأُمُورُ ۝٥٣﴾(الشُّورَىٰ).

واتە: بەوشێوەیەی وەحیمان بۆ پێغەمبەران کرد، ئەم قورئانەمان بە وەحی بۆ تۆ ناردووە ئەی پێغەمبەری خوا کە ڕۆح و مایەی ژیانی دڵەکانە، تۆ نەتدەزانی کتێب و باوەڕ و وردەکارییەکانی شەریعەت چییە پێش ئەوەی وەحیت بۆ بکەین، بەڵام ئێمە ئەم قورئانەمان کردووەتە نورێك هەرکەسێك بمانەوێت لە بەندەکانمان هیدایەتیان دەدەین، بێگومان تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ڕێنمایی دەکەیت و هیدایەتی خەڵك دەدەیت بۆ ڕێگای ڕاست؛ ئاین و ڕێگای خوایە کە خاوەن ئەوەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بەڕاستی سەرئەنجامی هەموو کاروکردەوەکان بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە و پاداشتیان دەداتەوە لەسەر کردەوەکانیان.

(وَقَدْ كَتَبْت هَذِهِ الْمُقَدِّمَةَ مُخْتَصَرَةً بِحَسَبِ تَيْسِيرِ اللَّهِ تَعَالَى مِنْ إمْلَاءِ الْفُؤَادِ وَاَللَّهُ الْهَادِي إلَي سَبِيلِ الرَّشَادِ).

واتە: ئەم پێشەکییە کورتەم نوسیوە، بەوشێوەیەی خوا ﷻ ئاسانی کردووە، لە دڵ و یادمەوە نوسیومە، خوا هیدایەتدەرە بۆ ڕێگای ڕاست و هیدایەت.

(فَصْلٌ:

يَجِبُ أَنْ يُعْلَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَيَّنَ لِأَصْحَابِهِ مَعَانِيَ الْقُرْآنِ كَمَا بَيَّنَ لَهُمْ أَلْفَاظَهُ فَقَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴿٤٤﴾﴾(النَّحل)، يَتَنَاوَلُ هَذَا وَهَذَا).

واتە: فەسڵێك:

پێویستە بزانرێت پێغەمبەری خوا ﷺ ماناکانی قورئانی ڕوونکردووەتەوە وەك چۆن لەفزەکانی ڕوونکردووەتەوە، ئەو ئایەتەی خوا ﷻ دەفەرموێت: بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوون بکەیتەوە ئەوەی کە بۆیان دابەزێنراوە؛ ئەمە هەردووکیان دەگرێتەوە.

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: ئەمە ڕەدێکی ڕوونی تێدایە لەسەر موفەوزەکان، کە دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ مانای ناو و سیفەتەکانی ڕوون نەکردووەتەوە، پێیان دەڵێین: ئەم قسەیەتان یان مەبەستتان ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ مانای ناو و سیفەتەکانی خوای ﷻ نەزانیوە، یان ئەوەی زانیوە و شاردوویەتییەوە، ئەگەر یەکەمیان بڵێن: وەسفتان کردووە بە نەزانین، ئەگەر دووەمیان بڵێن: وەسفتان کردووە بە خیانەت[1].

ئەمە یەکێکە لەو ڕێسا گشتییانەی کە شێخی ئیسلام باسی کردووە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەفز و مانای ئایەتەکانی قورئانی بۆ هاوەڵانی ڕوون کردووەتەوە، پاشان چەند بەڵگەیەك جگە لەو ئایەتەی سورەتی النحل باس دەکات کە بەڵگەن لەسەر ئەو ڕاستییە:

(١). (شرح مقدمة أصول التفسير)(٢١).

(وَقَدْ قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ السلمي: حَدَّثَنَا الَّذِينَ كَانُوا يُقْرِئُونَنَا الْقُرْآنَ: كَعُثْمَانِ بْنِ عفان وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ وَغَيْرِهِمَا أَنَّهُمْ كَانُوا إذَا تَعَلَّمُوا مِنْ النَّبِيِّ ﷺ عَشْرَ آيَاتٍ لَمْ يُجَاوِزُوهَا حَتَّى يَتَعَلَّمُوا مَا فِيهَا مِنْ الْعِلْمِ وَالْعَمَلِ قَالُوا: فَتَعَلَّمْنَا الْقُرْآنَ وَالْعِلْمَ وَالْعَمَلَ جَمِيعًا؛ وَلِهَذَا كَانُوا يَبْقَوْنَ مُدَّةً فِي حِفْظِ السُّورَةِ[(١)]).

**واته: ئەبوعبدالرحمانی سولەمی دەڵێت: ئەو هاوەڵانەی قورئانیان پێ دەخوێندین وەك عوسمانی كوڕی عەفان و عبداللەی كوڕی مەسعود رضي الله عنهما و جگە لەوانیش، باسی ئەوەیان بۆ كردین كاتێك فێری دە ئایەت بوونایە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ تێیان نەدەپەڕاند هەتاكو فێری ئەو زانست و كردەوانە دەبوون كە تێیاندا بوو، دەیانگوت: فێری قورئان و زانست و كردار دەبووین هەموو پێكەوە، لەبەر ئەوە ماوەیەك دەمانەوە هەتاكو سورەتێكیان لەبەر دەكرد.**

**شێخی ئیسلام ئەم ئەسەرەی هێناوە لەسەر ئەوەی هاوەڵان تەفسیر و مانای قورئانیان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وەرگرتووە و كردەوەیان پێكردووە، دەڵێت: هاوەڵان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ باسی ئەوەیان كردووە فێری تەفسیری قورئان دەبوون لەگەڵ خوێندنەوەی، كەسیان هەرگیز باسی ئەوەیان نەكردووە پێغەمبەری خوا ﷺ رێگربووە لە تەفسیركردنی ئایەتێك[(٢)].**

---

(١). أخرجه ابن أبي شيبة(٢٩٩٢٩)، وابن سعد في (الطبقات الكبرى)(١٧٢/٦)، قال: أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيُّ واسْمُهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حَبِيبٍ رَوى عَنْ عَلِيٍّ وعَبْدِ اللَّهِ وعُثْمانَ وقالَ حَجّاجُ بْنُ مُحَمَّدٍ: قالَ شُعْبَةُ: لَمْ يَسْمَعْ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيُّ مِن عُثْمانَ ولَكِنْ سَمِعَ مِن عَلِيٍّ.

(٢). (مجموع الفتاوى)(٣٠٨/١٣).

ئەمەش بەڵگەیە کە هاوەڵان کردار و زانستیان پێکەوە گرێداوە، ناشێت کەسێك کردار بە دەقێك بکات لە مانا و مەبەستی تێنەگەیشتبێت.

(وَقَالَ أَنَسٌ: كَانَ الرَّجُلُ إِذَا قَرَأَ الْبَقَرَةَ وَآلَ عِمْرَانَ جَلَّ فِي أَعْيُنِنَا[1]).

واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێت: ئەگەر پیاوێك سورەتی البقره و ئال عیمرانی بخوێندایە و لەبەر بکردایە لەبەر چاومان دەبووە خاوەن پلەوپایە و ڕێز.

ئەم ئەسەرەی ئەنەس ﵁ یەکێکی ترە لەو بەڵگانەی شێخی ئیسلام کردوویەتییە بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەفسیر و مانای ئایەتەکانی بۆ هاوەڵانی ڕوونکردووەتەوە، چونکە تەنها خوێندنەوە و لەبەرکردن ئەگەرچی پاداشت و گرنگی خۆیان هەیە نەبووەتە هۆکاری ئەو ڕێز و پلەوپایەیە، بەڵکو ئەو فەزڵ و ڕێزە لەبەر ئەو حوکمە زۆرانەیە کە لەو دوو سورەتە پیرۆزەدا هاتووە، زانراوەکە ئەو دوو سورەتە مەدەنین و یەکێك لە خەسڵەتەکانی سورەتە مەدەنییەکان ئەوەیە زیاتر حوکمەکانی تێدا ڕوونکراوەتە بە بەراورد بە سورەتە مەککییەکان.

(وَأَقَامَ ابْنُ عُمَرَ عَلَى حِفْظِ الْبَقَرَةِ عِدَّةَ سِنِينَ قِيلَ: ثَمَانِ سِنِينَ ذَكَرَهُ مَالِكٌ[2]).

---

(١). أخرجه أحمد (١١٢١٥) بلفظ: (جد فينا)، وابن حبان (١٥٢١) بلفظ: (عد فِينا ذا شَأْنٍ)، وصححه الألباني في (موارد الظمآن).
(٢). أخرجه مالك في الموطأ(١١) بلاغاً.

واتە: ئیبن عومەر چەند ساڵێکی پێچووە هەتاکو سورەتی البقرەی لەبەر کردووە؛ گوتراوە: هەشت ساڵی پێچووە، مالکی کوڕی ئەنەس ئەوەی باسکردووە.

(وَذَلِكَ أَنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَالَ: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ ٢٩﴾(ص).

واتە: لەبەر ئەوەی خوا ﷻ دەفەرموێت: ئەم کتێبە پیرۆزە کە قورئانە و پڕ بەرەکەت و چاکەیە بە وەحی بۆمان دابەزاندوویت ئەی پێغەمبەری خوا، بۆ ئەوەی بیر لە ئایەت و بەڵگەکانی بکەنەوە و پەند و ئامۆژگارییان لێوەربگرن و کرداریان پێبکەن .

ئیبن ئەبوحاتەم لە حەسەنی بەصرییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: سوێند بە خوا بیری نەکردووەتەوە و ڕانەماوە ئەو کەسەی قورئانی لەبەر کردووە و سنورەکانی بەزاندووە، هەتاکو کەسی واهەیە دەڵێت: هەموو قورئانم خوێندەوە، بەڵام کاریگەری قورئان لە خوڕەوشت و ئاکار و کرداریدا نابینرێت.

(وَقَالَ: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ٨٢﴾(النِّسَاء).

واتە: بۆچی ئەو کەسانە بەوردی قورئان ناخوێننەوە و لە ماناکانی تێنافکرن؟.

لە درێژەی ئایەتەکەدا دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ٨٢﴾، واتە: ئەگەر قسەی کەسێکی تر بووایە جگە لە خوای پەروەردگار ناکۆکی و دژیەکییەکی زۆریان تیادا بەدی دەکرد.

ئەم ئایەتە سەرزەنشتی کەسانێك دەکات کە قورئان بە وردییەوە ناخوێننەوە و لە

ماناکانی تێنافکرن، بەڵگەی ئەوەشی تێدایە کە قورئان فەرموودەی خوایە، چونکە هیچ ناکۆکی و دژیەکییەکی تێدا نییە، و حوکم و ئامۆژگارییەکانی پڕە لە دانایی.

(وَقَالَ: ﴿أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ ﴿٦٨﴾﴾(المُؤْمِنُون).

واتە: ئایا بێباوەڕان لە فەرموودەی خوا تێنەگەیشتوون و ڕانەماون هەتا بزانن ڕاستە و لای خواوە دابەزیوە.

(وَتَدَبُّرُ الْكَلَامِ بِدُونِ فَهْمِ مَعَانِيهِ لَا يُمْكِنُ، وَكَذَلِكَ قَالَ تَعَالَى: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢﴾﴾(يُوسُف)، وَعَقْلُ الْكَلَامِ مُتَضَمِّنٌ لِفَهْمِه).

واتە: ناشێت کەسێك تێڕابمێنێت بەبێ تێگەیشتن لە ماناکانی، خوای گەورە دەفەرموێت: ئێمە قورئانمان بە زمانی عەرەبی دابەزاندووە، بۆ ئەوەی بە عەقڵ بیر لە ماناکانی بکەنەوە و تێیبگەن؛ بە عەقڵ بیر لێکردنەوە و تێگەیشتن لەخۆ دەگرێت.

ئەو ئایەتانەی شێخی ئیسلام هێناویەتییەوە بۆ ئەوەی بیانکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەفسیری قورئانی بۆ هاوەڵانی کردووە، چونکە ئەگەر مانای قورئان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فێر نەبووبن ناتوانن تێیبگەن و کردەوەی پێ بکەن و بیکەن بە بەڵگە لەسەر حەڵاڵ و حەرام و پرسەکانی بیروباوەڕ و تەوحید و ئاکار و خووڕەوشتەکان، هەروەها هاوەڵان بۆ تابعییەکانیان باسکردووە بەوشێوەیەی لە

پێغەمبەری خواوە ﷺ فێربوون و بەوشێوەیە نەوە دوای نەوە ئەو زانستەیان گەیاندووە و لە مانا و مەبەستەکانی فەرموودەکانی خوا ﷻ تێگەیشتوون.

(وَمِنْ الْمَعْلُومِ أَنَّ كُلَّ كَلَامٍ فَالْمَقْصُودُ مِنْهُ فَهْمُ مَعَانِيهِ دُونَ مُجَرَّدِ أَلْفَاظِهِ فَالْقُرْآنُ أَوْلَى بِذَلِكَ.
وَأَيْضًا فَالْعَادَةُ تَمْنَعُ أَنْ يَقْرَأَ قَوْمٌ كِتَابًا فِي فَنٍّ مِنْ الْعِلْمِ كَالطِّبِّ وَالْحِسَابِ وَلَا يستشرحوه فَكَيْفَ بِكَلَامِ اللَّهِ الَّذِي هُوَ عِصْمَتُهُمْ وَبِهِ نَجَاتُهُمْ وَسَعَادَتُهُمْ وَقِيَامُ دِينِهِمْ وَدُنْيَاهُمْ؟).

واتە: هەموو قسەیەك كە دەكرێت مەبەست لێی تێگەیشتنە لە ماناكانی نەوەك تەنها لەفزەكانی، قورئان لە پێشترە كە خوا فەرموویەتی بۆ ئەوەی لە مانا و مەبەستەكانی تێبگەن.

هەروەها دابونەریت ڕێگە نادات كەسانێك كتێبێك لە هونەرێكی زانست بخوێننەوە وەك پزیشكی یان ژماردن و شەرحی نەكەن، ئەم كتێبەی خوا ﷻ كە هۆكاری پاراستنیانە و بەهۆیەوە ڕزگاریان دەبێت و سەرفرازی بەدەست دەهێنن و كاروفەرمانی ئاین و دونیای پێ ڕادەپەڕێنن چۆن بێ ماناكردن و تەفسیر دەمێنێتەوە؟.

شێخی ئیسلام بەڵگەیەكی عەقڵی باس دەكات ئەوە دەسەلمێنێت كە واقع و دابونەریت ڕێگا بەوە نادات قسەیەك بكرێت تەنها مەبەست لەفزەكە بێت و تێگەیشتن و مانا مەبەست نەبێت، نموونەی زانستی پزیشكی و بیركاری هێناوەتەوە، كە ناگونجێت

کتێبێك لەو بوارانەدا بنوسرێتەوە و شەرح و مانا نەکرێت بۆ ئەوەی خەڵك لێی تێبگەن، ئەگەر بۆ زانستێکی دونیایی نەگونجێت کتێبێك بەبێ شەرح و تەفسیرکردن و لێکدانەوە بێت، چۆن دەبێت ئەو گومانە بە قورئان ببردرێت کە فەرموودەی خوای پەروەردگارە و بەرنامەی ژیانی خەڵکە و بەختەوەری دونیا و قیامەتیانی لەسەر بەندە، بەبێ تەفسیر و ماناکردن و هەڵێنجانی حوکمەکان، ئەمە ڕەدە لەسەر ئەو لاڕێیانەی دەڵێن: مانای هەندێك لە وشەکانی قورئان بەتایبەت لە ناو و سیفەتە جوانەکانی خوای پەروەردگار ماناکانی نازانرێت (موفەوزەن) و لێکدانەوەی بۆ ناکەن دەڵێن: نازانین مانا و مەبەستی چییە بۆیە لێکدانەوەی بۆ ناکەین و تەفسیری ناکەین.

(وَلِهَذَا كَانَ النِّزَاعُ بَيْنَ الصَّحَابَةِ فِي تَفْسِيرِ الْقُرْآنِ قَلِيلًا جِدًّا وَهُوَ وَإِنْ كَانَ فِي التَّابِعِينَ أَكْثَرَ مِنْهُ فِي الصَّحَابَةِ فَهُوَ قَلِيلٌ بِالنِّسْبَةِ إلَي مَنْ بَعْدَهُمْ).

واتە: لەبەر ئەوە ناکۆکی لەنێو هاوەڵان لە تەفسیری قورئان زۆر کەمە، ئەگەرچی لە نێوان تابعییەکان زیاترە وەك لە هاوەڵان، بەڵام کەمە بە نیسبەت ناکۆکی ئەوانەی دوای ئەوان هاتوون.

چەرخی هاوەڵە بەڕێزەکان رضي الله عنهم کەمترین ناکۆکی تێدایە لە هەموو ڕوویەکەوە، چونکە ڕاستەوخۆ زانستیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەردەگرت و بیدعە و گومڕایی و حەز و ئارەزووەکان بوونیان نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەندێکیان پاڕاوەتەوە و

نزای کردووە وەك، ئیبن عەباس رضي الله عنهما دەڵێت: ((ضَمَّنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وقالَ: اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الكِتابَ، وفي رواية: اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الحِكْمَةَ))[١].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئامێزیگرتم و فەرمووی: پەروەردگارا فێری قورئانی بکە، لە ڕیوایەتێکدا: پەروەردگارا فێری دانای و کارلەجێی بکە.

و دەڵێت: ((أنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ الخَلاَءَ، فَوَضَعْتُ لَهُ وضُوءًا قالَ: مَن وضَعَ هَذا فَأُخْبِرَ فَقالَ اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ))[٢].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەرئاو، قاپێك ئاوم بۆ دانا، فەرمووی: کێ ئەمەی داناوە؟ باسیان بۆ کرد، فەرمووی: پەروەردگارا لە ئاین تێی بگەیەنە.

و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ((اللهمَّ فَقِّهْه في الدِّينِ، وعلِّمْه التأويلَ))[٣].

واتە: پەروەردگارا لە ئاین تێی بگەیەنە، و فێری لێکدانەوەی مانای قورئانی بکە.

ئیبن مەسعود رضي الله عنه دەڵێت: (نِعْمَ التُرجُمانُ للقرآنِ ابنُ عباسٍ)[٤].

واتە: چەندە ڕاڤەکارێکی باشی قورئانە ئیبن عەباس.

ئیبن تەیمییە دەڵێت: ئیبن مەسعود رضي الله عنه ئەم قسەیەی کردووە دەربارەی ئیبن عەباس رضي الله عنهما کە لەسەر بۆچوونی صەحیح ساڵی سی و سێ وەفاتی کردووە، ئیبن

---

(١). أخرجه البخاري.
(٢). أخرجه البخاري ومسلم.
(٣). أخرجه الطبراني، وصححه الألباني في الصحيحة(٢٥٨٩).
(٤). أخرجه أحمد في (فضائل الصحابة)، وابن أبي شيبة، والطبري، وصححه ابن تيمية وابن كثير وابن حجر والألباني.

عەباس سی و شەش ساڵ دوای ئەو ژیاوە، دەبێت چەند زانستی تری بە دەست هێنابێت دوای ئیبن مەسعود؟ ئەعمەش لە ئەبووائیلەوە دەڵێت: عەلی ﷺ ئیبن عەباسی بۆ مەوسمی حەج دیاری کرد، گوتاری بۆ خەڵك خوێندەوە سورەتی البقرەی خوێندەوە، و لە ڕیوایەتێکدا سورەتی النوری لە گوتارەکەیدا خوێندەوە، بە شێوازێك تەفسیری کرد ئەگەر ڕۆم و تورك و دەیلەم گوێیان لێبووایە موسڵمان دەبوون[١].

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: تەفسیری هاوەڵان ناکۆکی کەمە لەبەر دوو هۆ، یەکەم: لەبەر ئەوەی قورئان بە زمانی ئەوان دابەزیوە و گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە، بۆیە لە هەمووان زیاتر و باشتر لە ماناکانی تێدەگەیشتن، بەڵام دوای ئەوان زمان گۆڕانکاری بەسەر هات.

دووەم: کەمی حەز و ئارەزوویان و سەلامەتی نییەت و مەبەستیان، نابینیت کەسێکیان حەز و ڕەئی خۆی سەرخستبێت، بەڵکو تەنها حەق و ڕاستییان مەبەست بوو، لەبەر ئەوە حەق لە هەرکوێ بووایە پابەندی دەبوون[٢].

(وَكُلَّمَا كَانَ الْعَصْرُ أَشْرَفَ كَانَ الِاجْتِمَاعُ والائتلاف وَالْعِلْمُ وَالْبَيَانُ فِيهِ أَكْثَرَ وَمِنْ التَّابِعِينَ مَنْ تَلَقَّي جَمِيعَ التَّفْسِيرِ عَنْ الصَّحَابَةِ كَمَا قَالَ مُجَاهِدٌ عَرَضْتُ الْمُصْحَفَ عَلَي ابْنِ عَبَّاسٍ أُوقِفُهُ عِنْدَ كُلِّ آيَةٍ مِنْهُ وَأَسْأَلُهُ عَنْهَا؛ وَلِهَذَا قَالَ الثَّوْرِيُّ: إذَا جَاءَك التَّفْسِيرُ عَنْ مُجَاهِدٍ فَحَسْبُك بِهِ.

(١). (مجموع الفتاوى)(٣٦٥/١٣-٣٦٦).
(٢). (شرح مقدمة أصول التفسير)(٢٥).

وَلِهَذَا يَعْتَمِدُ عَلَى تَفْسِيرِهِ الشَّافِعِيُّ وَالْبُخَارِيُّ وَغَيْرُهُمَا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ وَكَذَلِكَ الْإِمَامُ أَحْمَد وَغَيْرُهُ مِمَّنْ صَنَّفَ فِي التَّفْسِيرِ يُكَرِّرُ الطُّرُقَ عَنْ مُجَاهِدٍ أَكْثَرَ مِنْ غَيْرِهِ. وَالْمَقْصُودُ أَنَّ التَّابِعِينَ تَلَقَّوْا التَّفْسِيرَ عَنْ الصَّحَابَةِ كَمَا تَلَقَّوْا عَنْهُمْ عِلْمَ السُّنَّةِ وَإِنْ كَانُوا قَدْ يَتَكَلَّمُونَ فِي بَعْضِ ذَلِكَ بِالِاسْتِنْبَاطِ وَالِاسْتِدْلَالِ كَمَا يَتَكَلَّمُونَ فِي بَعْضِ السُّنَنِ بِالِاسْتِنْبَاطِ وَالِاسْتِدْلَالِ).

**واتە: هەتاكو سەردەمەكە بەرِێزتر بێت كۆبوونەوە و تەبایی و زانست و ڕوونكردنەوەی تێدا زیاترە، كەسانێك هەیە لە تابعییەكان تەفسیری هەموو قورئانی لە هاوەڵانەوە وەرگرتووە، وەك موجاهید دەڵێت: موصحەفم خوێندەوە بەسەر ئیبن عەباسدا، لەسەر هەموو ئایەتێك دەموەستاند و پرسیارم لێدەكرد، لەبەر ئەوە سەوری دەڵێت: ئەگەر تەفسیرت لە موجاهیدەوە بۆ هات بەستە[١].**

**بۆیە شافعی و بوخاری و جگە لەوانیش لە زانایان پشت بە تەفسیرەكەی دەبەستن، هەروەها پێشەوا ئەحمەد[٢] و جگە لەویش كەلە تەفسیردا كتێبیان نوسیوە، ڕیوایەت لە موجاهیدەوە دووبارە دەكاتەوە زیاتر لە كەسانی تر.**

**مەبەست ئەوەیە تابعییەكان تەفسیریان لە هاوەڵانەوە وەرگرتووە وەك چۆن زانستی سوننەتیان لێوەرگرتوون، ئەگەرچی هەندێك جار ئیجتهادیان كردووە و حوكمیان لە**

---

(١). ئیبن كەسیر دەڵێت: سەوری دەڵێت: تەفسیر لە چوار كەس وەربگرن: موجاهید و عیكرمە و سەعیدی كوڕی جوبەیر و زەحاك. (البداية والنهاية)(٧٣٢/١٢).

(٢). صالح ئال الشيخ دەڵێت: لێرە شێخی ئیسلام باسی تەفسیری ئیمام ئەحمەد دەكات، ئەم تەفسیرە ون بووە و نازانرێت لە كوێیە، باسی ئەوە كراوە كە زۆر گەورە بووە، وەك باسی ئەوە دەكات ئیمام ئەحمەد ڕێگای ڕیوایەتكردنی دووبارە كردووەتەوە لە موجاهیدەوە، ئەم تەفسیرەی ئیمام ئەحمەد دیار نییە، هەندێك لە زانایان وەك زەهەبی لە (السير)دا نكوڵی درێژییان كردووە، ئیبن قەیم هەندێك شتی كەمی لێوە نەقڵكردووە. (شرح مقدمة أصةل التفسير)(٢١ص).

بەڵگەکان دەرهێناوە، هەر بەوشێوەش لە هەندێك سوننەتدا ئیجتهادیان کردووە و حوکمیان لە بەڵگەکانەوە دەرهێناوە.

لەم بڕگەیە شێخی ئیسلام باسی ئەوە دەکات هەتاکو لە سەردەمە زێڕینەکانی ئیسلامەوە نزیکتربیت ناکۆکی کەمترە، ئەوەش پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی پێکردووە، ئیبن مەسعود رضي الله عنه دەڵێت: ((سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ أيُّ النّاسِ خَيْرٌ؟ قالَ: قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ))[1].

واتە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ کێ باشترینی خەڵکە؟ فەرمووی: خەڵکی ئەم سەردەمەی من، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن.

صالح ئال الشیخ دەڵێت: ئیبن عەباس رضي الله عنهما مەدرەسەیەکی هەبوو لە تەفسیردا، کۆمەڵێك لە هاوەڵانی تەفسیریان لێوە وەرگرتووە، هەندێکیان وابەستەی بوون و زۆر لەگەڵیدا ماونەتەوە، لەوانە ئەبوحەجاج موجاهیدی کوڕی جەبر، کە تابعییە و پێشەوایەکی ناسراوە، چونکە تەفسیری سێ جار بەسەر ئیبن عەباسدا خوێندووەتەوە، لەسەر هەموو ئایەتێك ڕایگرتووە و پرسیاری ماناکەی لێ کردووە، هەروەها لە هاوەڵ و قوتابییەکانی ئیبن عەباس کە تەفسیریان لێ وەرگرتووە عەتای کوڕی ئەبوڕەباح، و سەعیدی کوڕی جوبەیر، و تاوسی کوڕی کەیسانی یەمانی، و کۆمەڵێکی ترن، ئەو قوتابیانەی تەفسیریان لە ئیبن عەباسەوە وەرگرتووە، ئەگەر حوکمێکیان هەڵێنجابێت

---

(١). أخرجه البخاري ومسلم.

بەپێی بنەمای ئیبن عەباس هەڵیانهێنجاوە کە فێری کردوون، بەتایبەت موجاهید وەك شێخی ئیسلام لێرە دەڵێت: (وَلِهَذَا قَالَ الثَّوْرِيُّ: إذَا جَاءَكَ التَّفْسِيرُ عَنْ مُجَاهِدٍ فَحَسْبُكَ بِهِ)، چونکە موجاهید چەند جارێك قورئانی بەسەر ئیبن عەباس خوێندووەتەوە، باوەڕوایە هەموو تەفسیری لە ئیبن عەباسەوە لەبەر کردبێت، لەوانەیە قورئانی تەفسیر کردبێت بەبێ ئەوەی بیداتە پاڵ ئیبن عەباس، لەوانەشە دابێتییە پاڵی، لەبەر ئەوە زانایان ئەو نوسراوەی پشتی پێدەبەستن لە تەفسیردا نوسراوی عەلی کوڕی تەڵحەیە لە ئیبن عەباسەوە، بە صەحیحترین ئەو ڕیواتانەی دادەنێن کەلە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتکراوە، ئەمە ئەو نوسراوەیە کە ئیمام ئەحمەد رحمە الله دەربارەی دەڵێت: (لە وڵاتی میسر نوسراوێك هەیە دەربارەی تەفسیر لە ئیبن عەباسەوە، ئەگەر کەسێك بچێت بۆ ئەوەی بە دەستی بهێنێت زۆری نەکردووە)[1]، زۆر درێژ نییە، بوخاری پشتی پێبەستووە لە صەحیحەکەیدا.

عەلی کوڕی تەڵحە ئەو نوسراوەی بینیوە (وجادة) و نەیبیستووە، چونکە عەلی نەگەیشتووەتە ئیبن عەباس، و زانایان دەڵێن: عەلی لە موجاهیدی بیستووە.

ئیبن حەجەر دەڵێت: (ئەگەر ئەو کەسەی گێڕاویەتییەوە ناسرا (وجادة) زیانی نییە، چونکە ئەو کەسەی لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە موجاهیدە، عەلی کوڕی تەڵحەش ئەو نوسراوەی لە موجاهیدەوە گێڕاوەتەوە)[2]، لەبەر ئەوە زۆرجار دەبینی تەبەری زۆربەی ئەوەی لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی دەکات لە ڕێگەی موعاوییەی کوڕی

---

(١). تفسير القرطبي(١٢/٨٥)، وفتح الباري(٨/٤٣٨).
(٢). الأمالي المطلقة(ص٦٢).

صالحەوە لە عەلی کوڕی تەڵحەوە لە ئیبن عەباسەوەیە[١].

صالح ئال الشیخ تێبینییەکی باسکردووە جێگای تێڕامانە، دەڵێت: هەموو کات ڕێساکانی زاراوەی فەرموودە (مصطلح الحدیث) ڕەچاو ناکرێت بۆ حوکمدان بەسەر سەنەدی تەفسیرەکانی قورئاندا، لەبەر ئەوە زۆرێك لە هاوچەرخەکان (معاصرین) لە ڕەخنەگرتنیان لە سەنەدی تەفسیر هەڵە دەکەن کاتێك بەهەمان ڕێبازی ڕەخنەگرتنیان بۆ سەنەدەکانی فەرموودە ڕەخنە لە سەنەدی تەفسیر دەگرن.

بەڵکو دەبینیت یەکێکیان سەری سوڕدەمێنێت لە تەبەری و ئیبن کەسیر و بەغەوی، هەتاکو لە ئیبن ئەبوحاتەم و هاوشێوەیان، لەبەر ڕیوایەتکردنی تەفسیر لە هاوەڵان و تابعییەکانەوە بە چەند سەنەدێك لەسەر ڕێبازی فەرموودەناسەکان لەوانەیە لاواز بێت، بەڵام لەسەر ئەو ڕێبازەی کە زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئان پشتیان پێبەستووە صەحیحە.

نموونەیەك بۆ ئەوە: فەرموودەی سودی کە خاوەنی تەفسیرە، تەفسیری قورئان دەکات بە هەڵێنجانی خۆی، لە کەسانی تریشەوە نەقلْ دەکات، لە ئەسباتی کوڕی نەصرەوە ڕیوایەت دەکات و تەفسیری لێوە دەکات، سودی قسەی لەسەر کراوە، هەروەها نەصر قسەی لەسەر کراوە، لەوانەیە بە لاوازیش دانرابێت، بەڵکو ڕەخنە لە مسلم گیراوە کە فەرموودەیانی ڕیوایەتکردووە، دێت دەڵێت: ئەم سەنەدە حەسەنە، لەوانەیە بڵێت: لاوازە، بەڵام لای زانایانی تەفسیر لە باشترین سەنەدەکانە، بەڵکو ئەوە باشترین سەنەدی تەفسیرەکەی سودییە، ئەگەرچی ئەسبات قسەی لەسەرە، ئەوە لە

(١). (شرح مقدمة أصول التفسير)(١٩-٢٠).

فەرموودە بەوشێوەیە، بەڵام لە گرنگیدانی بە تەفسیر تایبەتمەندی هەیە، بەتایبەت لە تەفسیری سودی، لە نوسین و بیرییەوە نەقڵی کردووە، کاتێك زانایان باسی ژیاننامەی دەکەن دەڵێن: ڕاوی تەفسیری سودییە[1].

---

(١). (المصدر السابق)(٢٣-٢٤).

(فَصْلٌ

الْخِلَافُ بَيْنَ السَّلَفِ فِي التَّفْسِيرِ قَلِيلٌ وَخِلَافُهُمْ فِي الْأَحْكَامِ أَكْثَرُ مِنْ خِلَافِهِمْ فِي التَّفْسِيرِ وَغَالِبُ مَا يَصِحُّ عَنْهُمْ مِنْ الْخِلَافِ يَرْجِعُ إلَي اخْتِلَافِ تَنَوُّعٍ لَا اخْتِلَافِ تَضَادٍّ، وَذَلِكَ صِنْفَانِ:).

واتە: فەسڵێك

ناكۆكی سەلەف لە تەفسیردا كەمە، ناكۆكییان لە حوكمەكاندا زیاترە لە ناكۆكییان لە تەفسیردا، زۆربەی ئەو ناكۆكییانەی بە صەحیحی لێیانەوە دەگێڕدرێتەوە ناكۆكی جۆرییە نەوەك ناكۆكی دژیەك، ئەوەش دوو جۆرە:

هاوەڵان و تابعییەكان و سەلەف ناكۆكییان لە تەفسیردا كەمە، لێرە شێخی ئیسلام ئاماژەی بۆ دوو جۆر ناكۆكی كردووە، ناكۆكی دژیەكی (اختلاف تضاد)، ئەم جۆرە لە ناكۆكی لە تەفسیردا دەگمەن و كەمە، دووەم ناكۆكی جۆرییە (اختلاف تنوع)، زۆربەی ناكۆكییەكان لەم جۆرەیە بۆ نموونە كەسێكیان بە شێر بڵێت: (القصورة) و كەسێكی تریان بڵێت: (الغضنفر).

(أَحَدُهُمَا: أَنْ يُعَبِّرَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ عَنْ الْمُرَادِ بِعِبَارَةِ غَيْرِ عِبَارَةِ صَاحِبِهِ تَدُلُّ عَلَي مَعْنًى فِي الْمُسَمّى غَيْرِ الْمَعْنَى الْآخَرِ مَعَ اتِّحَادِ الْمُسَمّى بِمَنْزِلَةِ الْأَسْمَاءِ الْمُتَكَافِئَةِ الَّتِي بَيْنَ الْمُتَرَادِفَةِ وَالْمُتَبَايِنَةِ؛ كَمَا قِيلَ فِي اسْمِ السَّيْفِ: الصَّارِمُ وَالْمُهَنَّدُ، وَذَلِكَ مِثْلُ أَسْمَاءِ اللَّهِ الْحُسْنى وَأَسْمَاءِ رَسُولِهِ ﷺ وَأَسْمَاءِ الْقُرْآنِ، فَإِنَّ أَسْمَاءَ اللَّهِ كُلَّهَا تَدُلُّ عَلَي مُسَمّى وَاحِدٍ فَلَيْسَ دُعَاؤُهُ بِاسْمِ مِنْ أَسْمَائِهِ

الْحُسْنى مُضَادًّا لِدُعَائِهِ بِاسْمِ آخَرَ؛ بَلْ الْأَمْرُ كَمَا قَالَ تَعَالى: ﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ ﴿١١٠﴾﴾(الإِسْرَاءِ).

یەکەم: هەریەکەیان بە گوزارشتێك مەبەستەکە دەرببڕێت، جیاواز لە گوزارشتی هاوەڵەکەی، کە بەڵگەیە لەسەر مانایەك لە ناولێنراوەکە جگە لەو مانایەی تر بۆ ناوی هەمان شت، هاوشێوەی ناوە هاوتاکانە کەلە نێوان هاوواتاکان و واتا ناکۆکەکاندا هەیە، وەك بە شمشێر دەگوترێت: (الصارم) و (المهند)، هەروەها نموونەی ناوە جوانەکانی خوا، و ناوەکانی پێغەمبەرەکەی ﷺ، و ناوەکانی قورئان، ناوە جوانەکانی خوا هەموویان بەڵگەن و ناون بۆ یەك ناولێنراوە، بۆیە پاڕانەوە بە ناوێك لە ناوەکانی دژ نییە لەگەڵ پاڕانەوە بە ناوێکی تر، بەڵکو بەوشێوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوا پێیان بڵێ: لە خوا (الله) بپاڕێنەوە یان لە ڕەحمان (الرحمن) بە هەرناوێك لە ناوەکانی بپاڕێنەوە، خوا ناوی جوان و پیرۆزی هەیە.

لە زانستی لۆژیکدا (منطق) دەلالەتی وشەکان لەسەر ناوە جوانەکانی خوا ﷻ سێ جۆرە:

یەکەم: دەلالەتی (مطابقة): دەلالەتی ناوە لەسەر زاتی خوای پەروەردگار کاتێك دەگوترێت (الرحمن)، (الجبار) مەبەستی زاتی خوای میهرەبانە کە ناوی (الرحمن) و (الجبار)ە، سیفەتی ڕەحمەت و باڵادەستی و توانا و دەسەڵاتی هەیە.

دووەم: دەلالەتی (تضمن) بریتییە لەو مانایانەی هەرناوێك لە خۆی دەگرێت،

(السميع) ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خوای پەروەردگار سیفەتی (سمع) لە خۆ دەگرێت، هەروەها هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکانی.

سێیەم: دەلالەتی (التزام) بریتییە لە دەلالەتی ناوێك لە سیفەتی تر لازمی ناوەکەیە، بۆ نموونە: ناوی (الخالق) سیفەتی دروستکردن بۆ خوا ﷻ دەسەلمێنێت، هەروەها ناوی (الخالق) سیفەتی زانست و توانا و دەسەڵات لازمییەتی، چونکە بە زانست و توانا و دەسەڵاتی فراوانی هەیە کە بەڵگەیە لەسەر ناو و سیفەتی (الخالق) و دروستکردنی هەموو دروستکراوەکان.

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: (الْمُسَمّى بِمَنْزِلَةِ الْأَسْمَاءِ الْمُتَكَافِئَةِ الَّتِي بَيْنَ الْمُتَرَادِفَةِ وَالْمُتَبَايِنَةِ) ئەمە ئیشکالی تێدایە ئیللا مەگەر نوسەر رحمه الله مەبەستی مانایەکی تربێت، ناوە هاوواتاکان (مترادف) ئەو ناوانەن دوو ناو یان زیاتر یەك مانایان هەبێت، و ناوە دژەکان (المتباينة) بەڵگەیە لەسەر دوو مانا، ئەم ناوانە بە ئیعتباری دەلالەتی ناولێنراوەکە هاومانایە، و بە ئیعتباری دەلالەتی لەسەر مانایەك کە تایبەتە بە هەر لەفزێکەوە جیاوازن[1].

وشەکان لە هەموو زمانێکدا یان هاومانای یەکترن (مترادف)، یان ماناکانیان دژە(متباين)، یان چەند وشەیەك یەك مانایان هەیە (المشتركة)، یان وشە و ناولێنراوێك بە چەند وشەیەك گوزارشتی لێ بکرێت (متكافئ)ن.

(١). (شرح مقدمة أصول التفسير)(٣٠).

(وَكُلُّ اسْمٍ مِنْ أَسْمَائِهِ يَدُلُّ عَلَي الذَّاتِ الْمُسَمَّاةِ وَعَلَي الصِّفَةِ الَّتِي تَضَمَّنَهَا الِاسْمُ ؛ كَالْعَلِيمِ يَدُلُّ عَلَي الذَّاتِ وَالْعِلْمِ، وَالْقَدِيرُ يَدُلُّ عَلَي الذَّاتِ وَالْقُدْرَةِ، وَالرَّحِيمُ يَدُلُّ عَلَي الذَّاتِ وَالرَّحْمَةِ).

واتە: هەموو ناوێك لە ناوە جوانەكانی خوا بەڵگەیە لەسەر زاتی كە ئەو ناوەی هەیە، و لەسەر ئەو سیفەتەی كەلە خۆی گرتووە، وەك (العليم) بەڵگەیە لەسەر زات و لەسەر زانست، و (القدير) بەڵگەیە لەسەر زات و لەسەر توانا و دەسەڵات، و (الرحيم) بەڵگەیە لەسەر زات و لەسەر بەزەیی.

سیفەتە جوانەكانی خوای پەروەردگار بە ئیعتباری لازمی بۆ زاتی پیرۆزی خوا دەبێتە سێ بەشەوە، ئیبن عوسەیمین دەڵێت: سیفەتەكانی خوا ﷻ بە ئیعتباری لازمی و لازم نەبوونی بۆ زاتی خوای پەروەردگار دەبێتە سێ بەشەوە:

یەكەم: سیفەتە زاتییەكان.

دووەم: سیفەتە كردارییەكان.

سێیەم: سیفەتی زاتی و كرداری بە دوو ئیعتبار.

سیفەتە زاتییەكان مەبەست ئەو سیفەتانەیە لازمە بە زاتی خواوە ﷻ كە بەردەوام لە ڕابردوو و لە ئایندەش بەو سیفەتە وەسف دەكرێت، وەك سیفەتی: ژیان (الحياة)، زانست (العلم)، توانا (القدرة)، عیزەت (العزة)، دانایی (الحكمة)، گەورەیی (العظمة)، گەورەیی شكۆ (الجلال)، پایەبەرزی (العلو)، و هاوشێوەی ئەو سیفەتانە، ناونراوە بە سیفەتی زاتی لەبەر ئەوەی لازمە بە زاتەوە، هەروەها هەردوو دەست و هەردوو چاو و

ڕوو، ئەم سیفەتانە سیفەتە خەبەرییەکانیشیان پێ دەگوترێت.

سیفەتە کردارییەکان پەیوەستە بە ویستەوە، لازم نییە بە زاتییەوە نەبە ئیعتباری جۆرەکەی و نەبە ئیعتباری سیفەتەکە بەتەنها، بۆ نموونە بەرز و بڵندبوون بەسەر عەرشدا (الاستواء)، دابەزین بۆ ئاسمانی دونیا، هاتن بۆ حوکمکردن لە نێوان بەندەکان لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەم سیفەتانە سیفەتی کردارین و پەیوەستن بە ویستی خوای پەروەردگارەوە، ئەگەر بیەوێت ئەنجامی دەدات یان ئەنجامی نادات، ئەم سیفەتانە نوێن بە ئیعتباری جۆرەکەی و بە ئیعتباری سیفەتەکەش بەتەنها، بەرز و بڵندبوون بەسەر عەرشدا (الاستواء)، نەبووە دوای دروستکردنی عەرش نەبێت، دابەزین بۆ ئاسمانی دونیا، نەبووە دوای دروستکردنی ئاسمان نەبێت، و هاتنی ڕۆژی قیامەت نابێت هەتاکو قیامەت نەیەت.

ئەو سیفەتانەی زاتی و کردارین بریتین لەو سیفەتانەی ئەگەر بڕوانیتە جۆرەکەی دەزانیت خوای پەروەردگار بەردەوام لە ڕابردوو و لە ئایندەش بەو سیفەتە وەسف دەکرێت، لازمە بە زاتی، بەڵام ئەگەر تەنها بڕوانیتە خودی سیفەتەکە دەزانیت پەیوەستە بە ویستەوە لازم نییە بە زاتییەوە، قسەکردنی خوای پەروەردگار بە نموونە بۆ ئەم جۆرە هێنراوەتەوە، چونکە بەردەوام لە ڕابردوو و لە ئایندەش بەو سیفەتە وەسف دەکرێت و قسە دەکات، قسەکردنی لە کەمالی پێویستە بۆ خوا ﷻ، و بە ئیعتباری قسەکردنێکی موعەیەن کە خوای پەروەردگار کەی بیەوێت قسە دەکات لە سیفەتە کردارییەکانە، چونکە بە ویستی خوایە ﷻ[1].

ئیبن عوسەیمین کۆمەڵە یاسایەکی بە سودی هێناوە، لەوانە: ناوەکانی خوای

(١). (مجموع فتاوى ورسائل)(١/١٢٤-١٢٥).

پەروەردگار ناون بە ئیعتباری دەلالەتی لەسەر زات، وەسفن بە ئیعتباری دەلالەتی لە ماناكان، بۆ نموونە: (السميع) ناوە بۆ زاتی خوای گەورە، و سیفەتی بیستن لەخۆ دەگرێت و خوای پەروەردگار سیفەتی بیستنی هەیە.

ناوەكانی خوای پەروەردگار ئەگەر دەلالەت بێت بۆ وەسفێكی تێپەڕ (متعدي) سێ شت لە خۆی دەگرێت:

یەكەم: جێگیربوونی ئەو ناوە بۆ خوای بالادەست.

دووەم: جێگیربوونی ئەو سیفەتەی تێیدایە بۆ خوای پەروەردگار.

سێیەم: جێگیربوونی ئەو حوكمەی لەخۆی گرتووە.

بۆ نموونە: (المحيي) واتە: زیندووكەرەوە، سیفەتێكی تێپەڕە، ئەوە ناوە بۆ خوای گەورە و سیفەتی زیندووكردنەوەی تێدایە، و حوكمی زیندووكردنەوەی بەندەكانیشی لەخۆ دەگرێت.

بەڵام ئەگەر ناوەكان بەڵگەبوون لەسەر وەسفێكی تێنەپەڕ (غير متعد) دوو شت لەخۆ دەگرێت:

یەكەم: جێگیربوونی ئەو ناوە بۆ خوای پەروەردگار.

دووەم: جێگیربوونی ئەو سیفەتەی لەخۆی گرتووە.

بۆ نموونە: (الحي) واتە: زیندوو، ناوی (الحي) بۆ خوای بالادەست دەسەلمێنێت، و سیفەتی ژیانیشی بۆ جێگیر دەكات.

ناوەكان و سیفەتەكانی خوای پەروەردگار دەبێت بە دەقی قورئان و سوننەت جێگیربووبن، عەقڵ بواری نییە لەو پرسەدا، بابەتی سیفەتەكانی پەروەردگار فراوانترە لە بابەتی ناوە جوان و پیرۆزەكانی.

هەموو ناوێك لە ناوە جوان و پیرۆزەكان سیفەتی تێدایە كە مانای ناوەكە دەلالەتە لەسەری، نابێت هیچ سیفەتێك بۆ خوا جێگیر بكرێت كە بە بەڵگەی قورئان و سوننەتی صەحیح جێگیر نەبوو بێت[١].

عەباد دەڵێت: هەموو ناوەكانی خوای گەورە شیتەڵ دەبێت (مشتق)، ناوەكان سیفەتی لێوە دادەتاشرێت، هیچ ناوێكی نییە شیتەڵ نەبێت(جامد)، ناوەكانی خوا ﷻ بەڵگەن لەسەر سیفەتەكانی، چونكە هەموو ناوێك سیفەتێكی لێوە دەردەهێنرێت، بەڵام هەموو سیفەتێك ناوی لێوە دەرناهێنرێت، لە سیفەتەكانەوە ناو وەرناگیرێت بەڵام لە ناوەكانەوە سیفەتەكان وەردەگیرێت، هەندێك سیفەتی زاتی هەیە وەك دەست و ڕوو ناوی لێوە وەرناگیرێت، هەندێك سیفەت هەیە وەك (استهزاء، خداع، مكر) هاوشێوەی ئەوانە، ناوی لێوە وەرناگیرێت ناگوترێت: (مخادع، ماكر، مستزىء) لە ناوی خوایە، بەڵام لە بەرامبەر و هاوشێوەی كرداری بێباوەڕان بەو سیفەتانە وەسف دەكرێت، و وشەی (یستحي) لە (حیي) وەرگیراوە[٢].

(وَمَنْ أَنْكَرَ دَلَالَةَ أَسْمَائِهِ عَلَى صِفَاتِهِ مِمَّنْ يَدَّعِي الظَّاهِرَ: فَقَوْلُهُ مِنْ جِنْسِ قَوْلِ غُلَاةِ الْبَاطِنِيَّةِ الْقَرَامِطَةِ الَّذِينَ يَقُولُونَ: لَا يُقَالُ هُوَ حَيٌّ وَلَا لَيْسَ بِحَيٍّ؛ بَلْ يَنْفُونَ عَنْهُ النَّقِيضَيْنِ؛ فَإِنَّ أُولَئِكَ الْقَرَامِطَةَ الْبَاطِنِيَّةَ لَا يُنْكِرُونَ اسْمًا هُوَ عِلْمٌ مَحْضٌ كَالْمُضْمَرَاتِ وَإِنَّمَا يُنْكِرُونَ مَا فِي أَسْمَائِهِ الْحُسْنَى مِنْ صِفَاتِ الْإِثْبَاتِ؛

(١). بڕوانە: (شرح القواعد المثلى).
(٢). (شرح سنن أبي داود)(٢٦/١٧٨).

فَمَنْ وَافَقَهُمْ عَلَى مَقْصُودِهِمْ كَانَ مَعَ دَعْوَاهُ الْغُلُوَّ فِي الظَّاهِرِ مُوَافِقًا لِغُلَاةِ الْبَاطِنِيَّةِ فِي ذَلِكَ؛ وَلَيْسَ هَذَا مَوْضِعَ بَسْطِ ذَلِكَ).

**واتە: هەرکەسێك نکۆڵی دەلالەتی ناوە جوانەکانی بکات لەسەر سیفەتەکانی لەو کەسانەی بانگەشەی ڕواڵەت دەکەن: قسەکەی لە ڕەگەزی قسەی باتنییە قەڕامیتە ڕۆچووەکانە، کە دەڵێن: ناگوترێت خوا (حي) و ناگۆرێت (حي) نییە؛ بەڵکو نەفی دژیەکی دەکەن، ئەو قەڕامیتە باتنییانە نکۆڵی ناوێك ناکەن کە عەلەمێکی پەتی بێت وەك ڕاناوەکان، بەڵکو ئەو سیفەتە جێگیرانە نکۆڵی دەکەن کەلە ناوە جوانەکانی خوادا ﷻ هەیە، هەرکەسێك هاوڕایان بێت لە مەبەستەکەیان لەگەڵ ئەوەی بانگەشەی ڕواڵەت دەکات لەوەدا هاوڕایە لەگەڵ باتنییە ڕۆچووەکان، ئێرە شوێنی درێژە پێدانی ئەو باسە نییە.**

**قەڕامیتەکان کۆمەڵێکی باتنین دراونەتە پاڵ پێشەواکەیان، زەهەبی لە باسی پێشەواکەیان دەڵێت: دوژمنی خوا سولەیمانی کوڕی حەسەنی قیرمەتی جەنابی ئەعرابی زەندیقە کە پاشای بەحرێن بوو، بەڕێکەوت بەرەو مەککە لەگەڵ حەوت سەد سوارچاك، حورمەتی حاجییەکانی لە حەرەمدا پێشێلکرد، بەردە ڕەشەکەی لە شوێنەکەی خۆی هەڵکەند، و بیری زەمزەمی پڕکرد لە لاشەی حاجی کوژراو، لە گەڕەکەکانی مەککە نزیکەی سی هەزار کەسی کوشت، شەش ڕۆژ لە حەرەم مایەوە، ئەو ساڵە کەس لە عەرەفات نەوەستا و ئیبن موحاربی ئەمیری مەککەی کوشت، بەرگەکەی کەعبەی لابرد و دەرگای کەعبەی هەڵکەند، بەردە ڕەشەکە و دەرگای کەعبەی لەگەڵ خۆی برد بۆ**

هەجەر، زیاد لە بیست ساڵ بەردە ڕەشەکە لایان مایەوە[(١)]، ئەم کۆمەڵە هەندێك بیروباوەڕی سەیریان هەبوو دەیانگوت: خوا (سمیع)ە بەبێ (سمع)، (بصیر)ە بەبێ (بصر) ناوەکەیان نکۆڵی نەدەکرد بەڵکو دەلالەت و مانای ناوەکەیان نکۆڵی دەکرد.

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە دەڵێت: خوا ﷻ هەواڵی پێداوین کە (علیم) و (قدیر) و (سمیع) و (بصیر) و (غفور) و (رحیم)ە، هەروەها هەموو ناو و سیفەتەکانی، ئێمە مانای ئەو ناو و سیفەتانە تێدەگەین و جیاوازی دەکەین لە نێوان (العلم) و (القدره) و (الرحمه) و (السمع) و (البصر)، و دڵنیاین و دەزانین هەموو ناوەکان کۆکن لە دەلالەتیان لەسەر زاتی خوا لەگەڵ جۆراوجۆری ماناکانیان، هاومان و هاوتان لە ڕوانگەی زاتەوە و جیاوازن لە ڕوانگەی ماناوە[(٢)].

(وَإِنَّمَا الْمَقْصُودُ أَنَّ كُلَّ اسْمٍ مِنْ أَسْمَائِهِ يَدُلُّ عَلَي ذَاتِهِ وَعَلَي مَا فِي الِاسْمِ مِنْ صِفَاتِهِ، وَيَدُلُّ أَيْضًا عَلَي الصِّفَةِ الَّتِي فِي الِاسْمِ الْآخَرِ بِطَرِيقِ اللُّزُومِ).

واتە: مەبەست ئەوەیە هەموو ناوێك لە ناوەکانی بەڵگەیە لەسەر زات و لەسەر ئەو سیفەتەی لە ناوەکە هەیە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەو سیفەتەی لە ناوێکی تردا هەیە بە ڕێگەی (اللزوم).

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: ناو بەڵگەیە لەسەر ئەو سیفەتەی لەخۆی گرتووە، و لەسەر

(١). (سير أعلام النبلاء)(٥١٦/١١).
(٢). (مجموع الفتاوى)(٥٩/٣).

ئەو سیفەتەی ناوێکی تر لەخۆی گرتووە بە ڕێگەی (اللزوم)، چونکە ناوی (الخالق) بەڵگەیە لەسەر سیفەتی دروستکردن، و بەڵگەیە لەسەر زانست کە ناوی (العلیم) لە خۆی گرتووە، و بەڵگە لەسەر توانا کە ناوی (القدیر) لە خۆی گرتووە، و ناوی (الخالق) بەڵگەیە لەسەر (العلیم القدیر) چونکە ناشێت دروستکراوەکان دروست بکات بە زانست و توانای نەبێت، لەبەر ئەوە خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ وَمِنَ ٱلۡأَرۡضِ مِثۡلَهُنَّۖ يَتَنَزَّلُ ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنَهُنَّ لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٖ قَدِيرٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىۡءٍ عِلۡمَۢا ١٢﴾(الطَّلاَق).

واتە: خوایە کە حەوت ئاسمانی دروستکردووە و حەوت چین زەویشی دروستکردووە، فەرمانی خوا دادەبەزێت لە نێوانیاندا، بۆ ئەوەی بزانن خوا توانا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، بێگومان خوا بە زانستی دەورەی هەموو شتێکیداوە[1].

(وَكَذَلِكَ أَسْمَاءُ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلُ: مُحَمَّدٍ وَأَحْمَد وَالْمَاحِي وَالْحَاشِرِ وَالعَاقِبِ).

واتە: هەروەها ناوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك: (محمد، ئەحمەد، ماحی، حاشر، و عاقب).

ئاماژە بۆ ئەو فەرموودە دەکات کە بوخاری و مسلم لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە

---

(١). شرح مقدمة أصول التفسير(٣٤-٣٥).

ڕیوایەتیان کردووە ئەمە لەفزی مسلمە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ لِي أَسْمَاءً؛ أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَنَا أَحْمَدُ، وَأَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللهُ بِيَ الْكُفْرَ، وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي، وَأَنَا الْعَاقِبُ الَّذِي لَيْسَ بَعْدَهُ أَحَدٌ - وَقَدْ سَمَّاهُ اللهُ ﴿رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ۝١٢٨﴾(التَّوْبَة)).

واتە: پێنج ناوم هەیە: من ناوم موحەمەد، و ئەحمەدە، و ناوم (الماحی)یە کە مانای سڕینەوەیە، خوا بێباوەڕی بە من دەسڕێتەوە و لەناوی دەبات، و من (الحاشر)م کە مانای کۆکەرەوەیە، پێش هەمووان زیندوو دەکرێمەوە و خەڵك هەموو دوای من زیندوو دەکرێنەوە و کۆ دەکرێنەوە و حەشر دەکرێن، و من (العاقب)م لە دوای هەموو پێغەمبەرانەوە ڕەوانەکراوم و هیچ پێغەمبەرێك دوای من نایەت، و خوا ناوی لێناوم: ﴿رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ۝١٢٨﴾(التَّوْبَة).

مسلم لە ئەبوموسای ئەشعەرییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُسَمِّي لَنَا نَفْسَهُ أَسْمَاءً، فَقَالَ: أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَحْمَدُ، وَالْمُقَفِّي، وَالْحَاشِرُ، وَنَبِيُّ التَّوْبَةِ، وَنَبِيُّ الرَّحْمَةِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی خۆی بە چەند ناوێك دەهێنا بۆمان، فەرمووی: من موحەمەد و ئەحمەد و (الحاشر)م کە مانای کۆکەرەوەیە، و پێش هەمووان زیندوو دەکرێمەوە و خەڵك هەموو دوای من زیندوو دەکرێنەوە و کۆدەکرێنەوە و حەشر دەکرێن، من پێغەمبەری تەوبەم و پێغەمبەری ڕەحمەت و بەزەیم.

(وَكَذَلِكَ أَسْمَاءُ الْقُرْآنِ مِثْلُ: الْقُرْآنِ وَالْفُرْقَانِ وَالْهُدَى وَالشِّفَاءِ وَالْبَيَانِ وَالْكِتَابِ، وَأَمْثَالِ ذَلِكَ).

واتە: هەروەها ناوەکانی قورئان وەك: (قورئان، فورقان، هودا، شیفا، بەیان، کیتاب، و هاوشێوەی ئەوانە).

قورئانی پیرۆز چەند ناوێکی هەیە باوترینیان قورئانە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ۝٣﴾(الزُّخْرُف).

(الكتاب) خوا دەفەرموێت: ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۝٩٢﴾(الأَنعَام).

(الفرقان) واتە: جیاکەرەوەی ڕاستی لە پووچەڵ و ناڕەوا خوا دەفەرموێت: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ۝١﴾(الفُرْقَان).

(الذكر) خوا دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ۝٩﴾(الحِجْر).

(فَإِذَا كَانَ مَقْصُودُ السَّائِلِ تَعْيِينَ الْمُسَمَّى عَبَّرْنَا عَنْهُ بِأَيِّ اسْمٍ كَانَ إِذَا عُرِفَ مُسَمَّى هَذَا الِاسْمِ).

واتە: ئەگەر مەبەستی ئەو کەسەی پرسیار دەکات لە تەفسیری قورئان دیاریکردنی ناولێنراوەکە بێت، گوزارشتی لێ دەکەین بە هەرناوێك ئەگەر ناولێنراوەکە بەو ناوەوە ناسراو بێت.

ئەو کەسەی پرسیار دەکات ئەگەر مەبەستی ناسینی خوای پەروەردگار بێت بە (الله) یان (الرحمن) یان (الرحیم) ناوی دەهێنین و باسی دەکەین، ئەگەر مەبەستی ناسینی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بە محمد یان ئەحمەد یان هەر ناوێکی تر کە پێی ناسراوە پێناسەی دەکەین و گوزارشتی لێ دەکەین، ئەگەر پرسیاری قورئان کرا بە هەر ناوێك لەو ناوانەی پێی ناسراوە بناسێنرێت لێکدانەوە و تەفسیری تەواوی بۆ کراوە، ئەگەر کەسێك بڵێت: قورئان چییە، لە وەڵامیدا بگوترێت کتێبێکە جیاکەوەی حەقە لە باتڵ، یان کتێبێکە چارەسەرە بۆ هەموو کێشە و ئارەیشەکانی بەندەکان یان بە هەر ناو و سیفەتێکی تری ناسراوی قورئان لێك بدرێتەوە مەبەستەکە بەدی دێت.

(وَقَدْ يَكُونُ الِاسْمُ عَلَمًا وَقَدْ يَكُونُ صِفَةً كَمَنْ يَسْأَلُ عَنْ قَوْلِهِ: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي ﴿١٢٤﴾﴾(طه) مَا ذِكْرُهُ؟.

فَيُقَالُ لَهُ: هُوَ الْقُرْآنُ مَثَلًا أَوْ هُوَ مَا أَنْزَلَهُ مِنْ الْكُتُبِ، فَإِنَّ الذِّكْرَ مَصْدَرٌ، وَالْمَصْدَرُ تَارَةً يُضَافُ إلَي الْفَاعِلِ وَتَارَةً إلَي الْمَفْعُولِ.

فَإِذَا قِيلَ ذِكْرُ اللَّهِ بِالْمَعْنَى الثَّانِي كَانَ مَا يُذْكَرُ بِهِ مِثْلَ قَوْلِ الْعَبْدِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وَاَللَّهُ أَكْبَرُ).

واتە: لەوانەیە ناو عەلەمێك بێت، و لەوانەیە سیفەت بێت، وەك ئەو کەسەی پرسیار دەکات دەربارەی ئەو فەرموودەیە: هەرکەسێك پشت لە زیکری من بکات؛ مەبەست لە زیکری خوا چییە؟.

لە وەڵامیدا دەگوترێت: قورئانە بۆ نموونە، یان ئەو کتێبانەیە خوا دایبەزاندووە،

چونكە زیكر چاوگە، چاوگیش جارێك دەدرێتە پاڵ بكەر (الفاعل)، و جارێك دەدرێتە پاڵ بەركار(المفعول بە).

ئەگەر گوترا: زیكری خوایە بە مانای دووەم، ئەوەیە كە زیكری خوای پێدەكرێت وەك ئەوەی بەندە بڵێت: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ).

(وَإِذَا قِيلَ بِالْمَعْنَى الْأَوَّلِ كَانَ مَا يَذْكُرُهُ هُوَ وَهُوَ كَلَامُهُ وَهَذَا هُوَ الْمُرَادُ فِي قَوْلِهِ: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى ﴿١٢٤﴾﴾(طه)، لِأَنَّهُ قَالَ قَبْلَ ذَلِكَ: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾﴾، وَهُدَاهُ هُوَ مَا أَنْزَلَهُ مِنْ الذِّكْرِ، وَقَالَ بَعْدَ ذَلِكَ: ﴿قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ﴿١٢٦﴾﴾(طه).

وَالْمَقْصُودُ أَنْ يُعْرَفَ أَنَّ الذِّكْرَ هُوَ كَلَامُهُ الْمُنَزَّلُ أَوْ هُوَ ذِكْرُ الْعَبْدِ لَهُ فَسَوَاءٌ قِيلَ ذِكْرِي كِتَابِي أَوْ كَلَامِي أَوْ هُدَايَ أَوْ نَحْوُ ذَلِكَ كَانَ الْمُسَمَّى وَاحِدًا).

واتە: ئەگەر گوترا مەبەست مانای یەكەمە، ئەوەیە خوا ﷻ باسی دەكات كە فەرموودەی خۆیەتی، ئەوەش مەبەستە لەو ئایەتەی كە دەفەرموێت: هەركەس پشت لە زیكری من بكات، چونكە پێش ئەوە فەرموویەتی: بێگومان هیدایەتێكتان لە لایەن منەوە بۆ دێت، هەركەسێك شوێنی هیدایەتی من بكەوێت نەگومڕا دەبێت، و نەبەدحاڵ دەبێت، هیدایەتی خوا ﷻ بریتییە لەو زیكرەیەی كە دایبەزاندووە، دوای ئەوە دەفەرموێت: دەڵێت: پەروەردگارا بۆ بە كوێری حەشرم دەكەیت، من لە دونیا چاوم ساغ بوو،

دەفەرموێت: بەوشێوە ئایەتەکانی ئێمەت بۆ هات لە بیرتکردن و پشت گوێت خستن.

مەبەستەکە ئەوەیە بزانرێت زیکر بریتییە لە فەرموودەی خوا کە دایبەزاندووە یان زیکری خوا لەلایەن بەندەوە، ئەگەر بگوترێت: زیکری خوا یان کتێبی خوا یان فەرموودەی خوا یان هیدایەتی خوا یان هاوشێوەی ئەوە، ناولێنراوەکە یەك شتە.

(وَإِنْ كَانَ مَقْصُودُ السَّائِلِ مَعْرِفَةَ مَا فِي الِاسْمِ مِنْ الصِّفَةِ الْمُخْتَصَّةِ بِهِ فَلَا بُدَّ مِنْ قَدْرٍ زَائِدٍ عَلَي تَعْيِينِ الْمُسَمَّى مِثْلَ أَنْ يَسْأَلَ عَنْ الْقُدُّوسِ السَّلَامِ الْمُؤْمِنِ وَقَدْ عَلِمَ أَنَّهُ اللَّهُ؛ لَكِنَّ مُرَادَهُ مَا مَعْنَى كَوْنِهِ قُدُّوسًا سَلَامًا مُؤْمِنًا وَنَحْوَ ذَلِكَ).

واتە: ئەگەر زانرا مەبەستی ئەو کەسەی پرسیاری تەفسیر دەکات زانینی ئەو سیفەتە تایبەتمەندە بێت لە ناوەکەدا هەیە، پێویستە ئەندازەیەك زیاتر لە دیاریکردنی ناو لێنراوەکاندا ڕوون بکرێتەوە، بۆ نموونە پرسیاری (القدوس، السلام، المؤمن) بکات، لە کاتێکدا زانیویەتی ئەوانە ناوی خوان ﷻ، بەڵام مەبەستی ئەوەیە مانای چییە خوا قودوس و سەلام و مؤمنە، و هاوشێوەی ئەوانە.

ئەگەر کەسێك بەتەنها پرسیار بکات بڵێت: المؤمن کێیە؟ لە وەڵامیدا دەگوترێت: خوایە ﷻ، بەڵام ئەگەر پرسیاری کرد المؤمن کە ناوی خوایە مانای چییە؟ ئەو کاتە وەڵامی دەدرێتەوەی المؤمن مانای ئەوەیە دروستکراوەکانی ئەمینن لەوەی ستەمیان لێ بکات، یان پاڵپشتی پێغەمبەرانی دەکات و بە بەڵگە ڕاستییان دەسەلمێنێت.

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ٢٢ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٢٣ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٢٣ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٢٤﴾(الحَشْر).

واتە: خوایە کە هیچ پەرستراوێکی حەق نییە جگە لە ئەو، زانای پەنهان و ئاشکرایە، میهرەبانی بە بەزەییە؛ خوایە هیچ پەرستراوێکی حەق نییە جگە لە ئەو، پاشای حەقە کەس ناتوانێت بەرهەڵستی بکات، پیرۆز و موبارەکە، لە هەموو کەموکورتییە بە دوورە لە زات و سیفات و کرداری، بەندەکانی ئەمینکردووە لەوەی ستەمیان لێ بکات، یان پێغەمبەرانی بەڕاست دەخاتەوە بە بەڵگەکانی، چاودێرە بەسەر بەندەکانییەوە و هەموو کردەوەکانیان دەبینێت، بەهێز و توانای باڵادەستە، هەموو دروستکراوەکانی ملکەچ و زەلیلین، و مەزن و گەورەیە، پاکی و بەرزی بۆ خوا لەوەی هاوبەش بڕیاردەران هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن؛ خوا دروستکاری بەدیهێنەری وێنەکێشە بە جوانترین شێوە وێنەی دروستکراوەکانی دەکێشێت، کۆمەڵە ناوێکی زۆر جوانی هەیە، هەموو ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەوییدا هەیە تەسبیحاتی خوا دەکەن، توانای باڵادەست و دانای کارلەجێیە.

لەم ئایەتانەدا چەند ناوێکی پیرۆزی خوا هاتووە، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وتِسْعِينَ اسْمًا مِئَةً إلّا واحِدًا، مَن أحْصاها دَخَلَ الجَنَّةَ)).

واتە: بێگومان خوا نەوەد و نۆ ناوی هەیە، هەرکەسێك لەبەریان بکات و کردەوە بە ماناکانی بکات و لە خوا پێیان بپاڕێتەوە دەچێتە بەهەشتەوە.

ئیبن کەسیر مانای ئەو ناوانەی کردووە و ئەمە پوختەی مانای هەندێك لەو ناوانەیە، ﴿ٱلْقُدُّوسُ﴾ وەهبی کوڕی مونەبە دەڵێت: واتە: پاك، موجاهید و قەتادە دەڵێن: واتە: موبارەك، ئیبن جورەیج دەڵێت: فریشتە بەڕێزەکان پیرۆز ڕایدەگرن، ﴿ٱلسَّلَٰمُ﴾ واتە: سەلامەتە لە هەموو کەموکورتی و عەیبێك لە زات و سیفات و کردارەکانی، ﴿ٱلْمُؤْمِنُ﴾ زەحاك دەڵێت: ئیبن عەباس ﷺ دەڵێت: دروستکراوەکانی ئەمینکردووە لەوەی ستەمیان لێ بکات، ئیبن زەید دەڵێت: بەندە باوەڕدارەکانی بەڕاست خستووەتەوە لە باوەڕیان بە پەروەردگاریان، ﴿ٱلْمُهَيْمِنُ﴾ ئیبن عەباس و زیاتر لە زانایەکی تر دەڵێن: شاهیدە بەسەر کردەوەی بەندەکانییەوە، واتە: چاودێرییانە، وەك ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ۝٩﴾(البُرُوج)، ﴿ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ۝٤٦﴾ (يُونُس)، ﴿ٱلْجَبَّارُ﴾ قەتادە دەڵێت: دروستکراوەکانی ناچارکردووە لەسەر هەرشتێك کە دەیەوێت، تەبەری دەڵێت: واتە: کاروباری دروستکراوەکانی بەڕێوە دەبات بەوشێوەیەی بەرژەوەندییانە، ﴿ٱلْمُتَكَبِّرُ﴾ بەرز و گەورە و مەزنە و دوورە لە هەموو خراپەیەك.

(إِذَا عُرِفَ هَذَا فَالسَّلَفُ كَثِيرًا مَا يُعَبِّرُونَ عَنْ الْمُسَمَّى بِعِبَارَةٍ تَدُلُّ عَلَي عَيْنِهِ وَإِنْ كَانَ فِيهَا مِنْ الصِّفَةِ مَا لَيْسَ فِي الِاسْمِ الْآخَرِ كَمَنْ يَقُولُ: أَحْمَد هُوَ الْحَاشِرُ وَالْمَاحِي وَالْعَاقِبُ، وَالْقُدُّوسُ هُوَ الْغَفُورُ وَالرَّحِيمُ أَيْ: أَنَّ الْمُسَمَّى وَاحِدٌ لَا أَنَّ هَذِهِ الصِّفَةَ هِيَ هَذِهِ الصِّفَةُ، وَمَعْلُومٌ أَنَّ هَذَا لَيْسَ اخْتِلَافَ تَضَادٍّ كَمَا يَظُنُّهُ بَعْضُ النَّاسِ).

واتە: ئەگەر ئەوە زانرا سەلەف زۆر جار ناولێنراوەکە بە تەعبیرێکی تر گوزارشت لێ دەکەن، کە بەڵگەیە لەسەر خودی، ئەگەر سیفەتێکی تێدابێت ئەو سیفەتە لە ناوەکەی تردا نەبێت، وەك ئەوەی کەسێك بڵێت: ئەحمەد، حاشر و ماحی و عاقبە؛ والقدوس، غەفور و ڕەحیمە، واتە: ناولێنراوەکە یەکە و مەبەست ئەوە نییە ئەو سیفەتە هەمان سیفەتەکەی ترە، زانراوە ئەمە ناکۆکی دژ یەك نییە، وەك هەندێك خەڵك بەوشێوەیە گومان دەبەن.

(مِثَالُ ذَلِكَ تَفْسِيرُهُمْ لِلصِّرَاطِ الْمُسْتَقِيمِ؛ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: هُوَ "الْقُرْآنُ": أَيْ اتِّبَاعُهُ؛ لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَدِيثِ عَلِيٍّ الَّذِي رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ وَرَوَاهُ أَبُو نُعَيْمٍ مِنْ طُرُقٍ مُتَعَدِّدَةٍ: ((هُوَ حَبْلُ اللَّهِ الْمَتِينُ وَهُوَ الذِّكْرُ الْحَكِيمُ وَهُوَ الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ))[1].

نموونەی ئەوە تەفسیرکردنی (الصراط المستقيم)، هەندێکیان دەڵێن: بریتییە لە قورئان، واتە: شوێنکەوتنی قورئان، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ

(١). قال الألباني في (ضعيف الجامع الصغير)(٢٠٨١): ضعيف جدا.

کە ئەبونەعیم لە چەند ڕێگایەکەوە لە عەلییەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە، دەفەرموێت: پەتی پتەوی خوایە و زیکر و یاد و داناییە، و ڕیگای ڕاستە.

(وَقَالَ بَعْضُهُمْ: هُوَ "الْإِسْلَامُ"؛ لِقَوْلِهِ ﷺ فِي حَدِيثِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ الَّذِي رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ وَغَيْرُهُ: ((ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا صِرَاطًا مُسْتَقِيمًا وَعَلَي جَنَبَتَيْ الصِّرَاطِ سُورَانِ وَفِي السُّورَيْنِ أَبْوَابٌ مُفَتَّحَةٌ وَعَلَي الْأَبْوَابِ سُتُورٌ مُرْخَاةٌ وَدَاعٍ يَدْعُو مِنْ فَوْقِ الصِّرَاطِ وَدَاعٍ يَدْعُو عَلَي رَأْسِ الصِّرَاطِ قَالَ: فَالصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ هُوَ الْإِسْلَامُ وَالسُّورَانِ حُدُودُ اللَّهِ وَالْأَبْوَابُ الْمُفَتَّحَةُ مَحَارِمُ اللَّهِ وَالدَّاعِي عَلَي رَأْسِ الصِّرَاطِ كِتَابُ اللَّهِ وَالدَّاعِي فَوْقَ الصِّرَاطِ وَاعِظُ اللَّهِ فِي قَلْبِ كُلِّ مُؤْمِنٍ))[1].

و هەندێکیان دەڵێن: بریتییە لە ئیسلام، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی نەواسی کوڕی سەمعان ﷺ کە ترمزی و جگە ئەویش ڕیوایەتیان کردووە: دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: خوا ﷻ نموونەی ڕێگایەکی ڕاستی هێناوەتەوە، کەلە هەردوو لای ڕێگاکەوە دوو دیوار هەیە، لە دوو دیوارەکەوە دەرگای کراوە هەیە، بەڵام دەرگاکان پەردەیان لەسەرە و دادراوەتەوە، بانگەواز کارێك لە سەرووی ڕێگاکەوە بانگەواز دەکات، و بانگەواز کارێك لەسەر ڕێگاکە بانگەواز دەکات، دەفەرموێت: ڕێگا ڕاستەکە ئیسلامە، دوو دیوارەکە سنورەکانی خوایە، دەرگا کراوەکانیش حەرامکراوەکانی خوایە، ئەو بانگەواز کارەی لەسەر ڕێگاکەیە کتێبەکەی خوایە، ئەو بانگەواز کارە لەسەرووی ڕێگاکەیە ئامۆژگاری خوایە لە دڵی هەموو باوەڕدارێکدا.

---

(١). أخرجه أحمد والترمذي والنسائي في (السنن الكبرى) وصححه الألباني في (صحيح الجامع)(٣٨٨٧).

(فَهَذَانِ الْقَوْلَانِ مُتَّفِقَانِ؛ لِأَنَّ دِينَ الْإِسْلَامِ هُوَ اتِّبَاعُ الْقُرْآنِ، وَلَكِنْ كُلٌّ مِنْهُمَا نَبَّهَ عَلَى وَصْفٍ غَيْرِ الْوَصْفِ الْآخَرِ، كَمَا أَنَّ لَفْظَ "صِرَاطٍ" يُشْعِرُ بِوَصْفٍ ثَالِثٍ).

واتە: ئەم دوو لێکدانەوەیە تەبان، چونکە ئاینی ئیسلام بریتییە لە شوێنکەوتنی قورئان، بەڵام هەریەکەیان وەسفێکی باسکردووە جگە لە وەسفەکەی تر، وەك چۆن لەفزی سیرات هەستی ئەوە دەبەخشێت وەسفێکی تری هەبێت.

(وَكَذَلِكَ قَوْلُ مَنْ قَالَ: هُوَ "السُّنَّةُ وَالْجَمَاعَةُ"، وَقَوْلُ مَنْ قَالَ: "هُوَ طَرِيقُ الْعُبُودِيَّةِ"، وَقَوْلُ مَنْ قَالَ: "هُوَ طَاعَةُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ﷺ"، وَأَمْثَالُ ذَلِكَ؛ فَهَؤُلَاءِ كُلُّهُمْ أَشَارُوا إِلَى ذَاتٍ وَاحِدَةٍ؛ لَكِنْ وَصَفَهَا كُلٌّ مِنْهُمْ بِصِفَةٍ مِنْ صِفَاتِهَا).

واتە: هەروەها بۆچوونی ئەو کەسانەی دەڵێن: سیرات بریتییە لە سوننەت و جەماعەت، و بۆچوونی ئەو کەسانەی دەڵێن: بریتییە لە ڕێگای پەرستن، و بۆچوونی ئەو کەسانەی دەڵێن: بریتییە لە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ، هاوشێوەی ئەوانە؛ هەموو ئەوانە ئاماژەیان بۆ یەك زات کردووە، بەڵام هەریەکەیان بە سیفەتێك لە سیفەتەکانی وەسفیان کردووە.

شێخی ئیسلام پێنج لێکدانەوەی بۆ (الصراط المستقیم) هێناوە، یەکەم: شوێنکەوتنی قورئانە، دووەم: ئیسلامە، دەڵێت: ئەم دوو مانایە کۆك و تەبان، چونکە ئاینی ئیسلام بریتییە لە شوێنکەوتنی قورئان، سێیەم: سوننەت و جەماعەتە، چوارەم: بریتییە لە ڕێبازی پەرستش، پێنجەم: بریتییە لە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ، هەموو ئەوانە لێکدانەوە بۆ "ڕێگای ڕاست" هەریەکەیان بە سیفەتێك لە سیفەتەکانی لێکدانەوە

و شیکاری بۆ کردووە، هەموو ئەم مانایانە لە ناکۆکی جۆرییە و دژیەکنین لەبەر ئەوەی هەریەکە لەو لێکدانەوەیانە دژ نییە لەگەڵ ماناکەی تر.

("الصِّنْفُ الثَّانِي": أَنْ يَذْكُرَ كُلٌّ مِنْهُمْ مِنْ الِاسْمِ الْعَامِّ بَعْضَ أَنْوَاعِهِ عَلَي سَبِيلِ التَّمْثِيلِ وَتَنْبِيهِ الْمُسْتَمِعِ عَلَي النَّوْعِ، لَا عَلَى سَبِيلِ الْحَدِّ الْمُطَابِقِ لِلْمَحْدُودِ فِي عُمُومِهِ وَخُصُوصِهِ.
مِثْلَ سَائِلٍ أَعْجَمِيٍّ سَأَلَ عَنْ مُسَمَّى "لَفْظِ الْخُبْزِ" فَأُرِيَ رَغِيفًا وَقِيلَ لَهُ: هَذَا، فَالْإِشَارَةُ إلَي نَوْعِ هَذَا لَا إلَي هَذَا الرَّغِيفِ وَحْدَهُ).

واتە: جۆری دووەم: هەریەکەیان باسی هەندێك جۆری ناوە گشتییەکە بکات وەك نموونە و ئاگادارکردنەوەی گوێگر لەسەر ئەو جۆرە، نەوەك پێناسەی هاوتای بۆ گشتییەتی و تایبەتمەندی پێناسەکراوەکە.

نموونەی کەسێکی جگە لە عەرەب (ئەعجەمی) پرسیار لە (لەفزی نان) بکات، کولێرەیەکی پیشان بدرێت و پێی بگوترێت: ئەمەیە، ئەمە ئاماژەیە بۆ جۆر نەوەك کولێرەکە بەتەنها.

جۆری یەکەم کە شێخی ئیسلام باسیکرد ناکۆکی جۆری بوو، کە ناولێنراوێکیان بە چەند مانایەکی جیاواز مانا و ڕاڤەکردووە و ئەو مانایانە دژ و ناکۆکنین، جۆری دووەم: باسکردنی ناوێکی گشتییە بەهەندێك لە جۆرەکانی.

(مِثَالُ ذَلِكَ مَا نُقِلَ فِي قَوْلِهِ: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ ﴿٣٢﴾﴾(فَاطِر)؛ فَمَعْلُومٌ أَنَّ الظَّالِمَ لِنَفْسِهِ يَتَنَاوَلُ الْمُضَيِّعَ لِلْوَاجِبَاتِ وَالْمُنْتَهِكَ لِلْمُحَرَّمَاتِ.

وَالْمُقْتَصِدُ يَتَنَاوَلُ فَاعِلَ الْوَاجِبَاتِ وَتَارِكَ الْمُحَرَّمَاتِ وَالسَّابِقُ يَدْخُلُ فِيهِ مَنْ سَبَقَ فَتَقَرَّبَ بِالْحَسَنَاتِ مَعَ الْوَاجِبَاتِ، فَالْمُقْتَصِدُونَ هُمْ أَصْحَابُ الْيَمِينِ ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾﴾(الوَاقِعَة)، ثُمَّ إِنَّ كُلًّا مِنْهُمْ يَذْكُرُ هَذَا فِي نَوْعٍ مِنْ أَنْوَاعِ الطَّاعَاتِ كَقَوْلِ الْقَائِلِ: السَّابِقُ الَّذِي يُصَلِّي فِي أَوَّلِ الْوَقْتِ وَالْمُقْتَصِدُ الَّذِي يُصَلِّي فِي أَثْنَائِهِ وَالظَّالِمُ لِنَفْسِهِ الَّذِي يُؤَخِّرُ الْعَصْرَ إِلَى الِاصْفِرَارِ).

نموونەی ئەوەیە کە دەربارەی ئەو ئایەتە هاتووە کە دەفەرموێت: پاشان ئەم کتێبەمان کرد بەمیراتی و بەخشیمان بە ئەو بەندانەمان کە هەڵمانبژاردن، هەندێکیان ستەم لەنەفسی خۆیان دەکەن و ئەوەی پێویستە لەسەریان کەمتەرخەمی تێدا دەکەن، هەندێکیان مامناوەندن و ئەوەی پێویستە لەسەریان بەجێی دەهێنن و خۆیان لە قەدەغەکراوەکان بە دووردەگرن، هەندێکیان پێشبڕکێ دەکەن لە ئەنجامدانی چاکەکان و خۆیان لە قەدەغەکراوەکان دووردەخەنەوە؛ زانراوە ئەو کەسەی ستەم لە نەفسی خۆی دەکات ئەو کەسە دەگرێتەوە کە کەمتەرخەمی دەکات لە بەجێهێنانی واجبەکان، و ئەنجامدانی حەرامکراوەکان، و ئەو کەسەی دەستگیرۆیە (مقتصد) ئەو کەسە دەگرێتەوە کە واجبەکان ئەنجام دەدات و وازدەهێنێت لە حەرام کراوەکان، ئەو کەسەی پێشبڕکێ دەکات ئەو کەسانە دەگرێتەوە پەرستش دەکەن بە ئەنجامدانی چاکەکان لەگەڵ بەجێهێنانی

واجبەکان، ئەوانەی دەستگیرۆن بریتین لە هاوەڵانی دەستەڕاست ئەوانەی پێشەنگن و پێشبڕکێ دەکەن لە ئەنجامدانی کردەوە چاکەکان؛ ئەوانە کەسانی نزیکن لە خواوە؛ پاشان هەریەکەیان ئەمە لە جۆرێك لە جۆرەکانی گوێڕایەڵیدا باس دەکات، وەك ئەو قسەی کەسێك کە دەڵێت: پێشبڕکێکار ئەو کەسەیە کە نوێژ لە سەرەتای کاتەکەیدا بەجێ دەهێنێت، و دەستگرۆ ئەو کەسەیە لە کاتی دیاریکراودا نوێژ بەجێ دەهێنێت، و ستەمکار لە نەفسی ئەو کەسەیە نوێژی عەسر دوا دەخات بۆ کاتی زەردبوونی تیشکی خۆر.

ئیبن کەسیر لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا دەڵێت: ﴿ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا﴾ ئەم ئوممەتەن، پاشان دابەشیکردن بۆ سێ جۆر، دەفەرموێت: ﴿فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾ ئەو کەسەیە کەمتەرخەمە لە بەجێهێنانی هەندێك لە واجبەکان، و هەندێك لە حەرامکراوەکان ئەنجام دەدات، ﴿وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ﴾ ئەو کەسەیە واجبەکان بەجێ دەهێنێت و حەرام کراوەکان وازلێدەهێنێت، و لەوانەیە هەندێك لە سوننەتەکان وازلێبهێنێت، هەندێك لە مەکروهەکان ئەنجام بدات، ﴿وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ ئەو کەسەیە واجب و سوننەتەکان بەجێ دەهێنێت، وازدەهێنێت لە حەرام و مەکروهەکان، هەندێك لە حەڵاڵکراوەکان؛ ئەحمەد و ترمزی لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ

﴿وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾ فەرموویەتی: ئەو کەسانە هەموویان لە یەك پلەوپایەدان و هەموویان لە بەهەشتدان؛ تەبەری و ئیبن ئەبوحاتەم و بەیهەقی لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ئەم ئایەتە: ﴿ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ﴾ ئوممەتی محمدن ﷺ، خوا کردوویانییەتی بە میراتگری هەموو ئەو کتێبانەی خوا دایبەزاندووە، ستەمکارەکەیان خوا لێی خۆش دەبێت، مامناوەندەکەیان لێپرسینەوەیەکی ئاسانی لەگەڵدا دەکرێت، ئەوەیان پێشبڕکێی کردووە لە ئەنجامدانی چاکە بەبێ لێپرسینەوە دەچێتە بەهەشتەوە؛ تەبەری لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ئەم ئوممەتە سێ بەشە لە ڕۆژی قیامەتدا: بەشێکیان دەچنە بەهەشتەوە بەبێ لێپرسینەوە، بەشێکیان لێپرسینەوەیەکی ئاسانیان لەگەڵدا دەکرێت، بەشێکیان بەتاوانی گەورەوە دەهێنرێن خوای پەروەردگار دەفەرموێت و زانایە بە حاڵیان: ئەمانە کێن، فریشتە دەفەرموون: ئەوانە بە تاوانی گەورەوە گەڕاونەتەوە، بەڵام هاوبەشیان بۆ بڕیار نەداوە، خوا دەفەرموێت: ئەوان بخەنە ژێر فراوانی ڕەحمەتم، ئیبن مەسعود ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ﴾.

(وَيَقُولُ الْآخَرُ: السَّابِقُ وَالْمُقْتَصِدُ وَالظَّالِمُ قَدْ ذَكَرَهُمْ فِي آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فَإِنَّهُ ذَكَرَ الْمُحْسِنَ بِالصَّدَقَةِ وَالظَّالِمَ بِأَكْلِ الرِّبَا وَالْعَادِلَ بِالْبَيْعِ وَالنَّاسُ فِي الْأَمْوَالِ إمَّا مُحْسِنٌ وَإِمَّا عَادِلٌ وَإِمَّا ظَالِمٌ؛ فَالسَّابِقُ الْمُحْسِنُ بِأَدَاءِ الْمُسْتَحَبَّاتِ

مَعَ الْوَاجِبَاتِ وَالظَّالِمُ آكِلُ الرِّبَا أَوْ مَانِعُ الزَّكَاةِ وَالْمُقْتَصِدُ الَّذِي يُؤَدِّي الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ وَلَا يَأْكُلُ الرِّبَا، وَأَمْثَالُ هَذِهِ الْأَقَاوِيلِ).

واته: یەكێكی تر دەڵێت: (السابق، المقتصد، والظالم) خوا ﷻ لە كۆتایی سورەتی البقرەدا باسیكردوون، چونكە باسی ئەو چاكەكارەی كردووە كە دەبەخشێت، و ئەو ستەمكارەی كە ڕیبا دەخوات، و ئەو كەسەی دادگەرە لە كڕین و فرۆشتندا، خەڵك لە سامانەكاندا چاكەكارن، یان دادگەرن، یان ستەمكارن، (السابق) ئەو چاكەكارەیە كرداره سونەتەكانیش ئەنجام دەدات لەگەڵ واجبەكان، (الظالم) ڕیباخۆرە یان ئەو كەسەیە كە زەكات نادات، (المقتصد) ئەو كەسەیە ئەو زەكاتەی پێویستە لەسەری دەیبەخشێتە و ڕیبا ناخوات، و هاوشێوەی ئەم قسانە.

(فَكُلُّ قَوْلٍ فِيهِ ذِكْرُ نَوْعٍ دَاخِلٍ فِي الْآيَةِ ذُكِرَ لِتَعْرِيفِ الْمُسْتَمِعِ بِتَنَاوُلِ الْآيَةِ لَهُ وَتَنْبِيهِهِ بِهِ عَلَي نَظِيرِهِ؛ فَإِنَّ التَّعْرِيفَ بِالْمِثَالِ قَدْ يَسْهُلُ أَكْثَرَ مِنْ التَّعْرِيفِ بِالْحَدِّ الْمُطْلَقِ، وَالْعَقْلُ السَّلِيمُ يَتَفَطَّنُ لِلنَّوْعِ كَمَا يَتَفَطَّنُ إذَا أُشِيرَ لَهُ إلَي رَغِيفٍ فَقِيلَ لَهُ: هَذَا هُوَ الْخُبْزُ).

واته: هەموو بۆچوونێك باسی جۆرێكی تێدایە كە ئایەتەكە دەیگرێتەوە، باسكراوە بۆ ئەوەی گوێگر بزانێت ئایەتەكە دەیگرێتەوە و سەرنج ڕاكێشانییەتی بۆ هاوشێوەكانی؛ چونكە پێناسەكردن بە نموونە ئاسانترە لە پێناسە بە پێناسە و سنورێك بە ڕەهایی، عەقڵی سەلامەت تێدەگات لە جۆر وەك چۆن تێدەگات ئەگەر ئاماژەی بۆ بكرێت بۆ كولێرەیەك و پێی بگوترێت: ئەمە نانە.

(وَقَدْ يَجِيءُ كَثِيرًا مِنْ هَذَا الْبَابِ قَوْلُهُمْ: هَذِهِ الْآيَةُ نَزَلَتْ فِي كَذَا لَاسِيَّمَا إنْ كَانَ الْمَذْكُورُ شَخْصًا؛ كَأَسْبَابِ النُّزُولِ الْمَذْكُورَةِ فِي التَّفْسِيرِ، كَقَوْلِهِمْ: إنَّ آيَةَ الظِّهَارِ نَزَلَتْ فِي امْرَأَةِ أَوْسِ بْنِ الصَّامِتِ).

واتە: زۆر جار لەو بابەتەیە کە دەڵێن: ئەم ئایەتە لەسەر ئەوە دابەزیوە، بەتایبەت ئەگەر ئەوەی باس دەکرێت کەسێك بێت، وەك ئەو هۆکاری دابەزینانەی باسکراوەکان لە تەفسیردا.

وەك ئەوەی دەڵێن: ئایەتی زیهار لەسەر هاوسەرەکەی ئەوسی کوڕی صامت دابەزیوە.

ئایەتەکانی زیهار ئەم ئایەتانەن کە خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ١ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمۡۖ إِنۡ أُمَّهَٰتُهُمۡ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدۡنَهُمۡۚ وَإِنَّهُمۡ لَيَقُولُونَ مُنكَرٗا مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ وَزُورٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ٢ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ٣ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ مِن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ فَإِطۡعَامُ سِتِّينَ مِسۡكِينٗاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٤﴾(المُجَادلَة).

واتە: بێگومان خوا قسەی ئەو ئافرەتەی بیست کە سەبارەت بە هاوسەرەکەی مشتومڕ و قسە و باسی لەگەڵدا کردیت، سکاڵای لای خوا دەکرد، خوا گفتوگۆکەتانی

بیست، بێگومان خوا بیسەری گوفتار و بینەری کرداری بەندەکانییەتی و هیچی لێشاراوە نییە؛ ئەوانەی بە هاوسەرەکانیان دەڵێن: وەك دایکمی، هاوسەرەکانیان دایکیان نین، بێگومان دایکیان ئەوانەن لێیانەوە لە دایکبوون، بەڕاستی قسەیەکی خراپ و تاوان و درۆ بە زاریاندا دێت، بێگومان خوا لێبوردە و لێخۆشبوو و پۆشەری تاوانە؛ ئەوانەی بە هاوسەرەکەیان دەڵێن: وەك دایکمی، پاشان پەشیمان دەبنەوە لەو قسەیەی کردوویانە، ئەگەر بیانەوێت لەگەڵ هاوسەرەکانیان جووتبن، دەبێت بەندەیەك ئازاد بکەن پێش ئەوەی لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا جووتبن، خوا بەوە ئامۆژگاریتان دەکات، خوا شارەزایە بەهەموو ئەو کردەوانەی ئەنجامیدەدەن، و هیچی لێشاراوە نییە؛ هەرکەسێك بەندەی نەبوو ئازادی بکات، دوو مانگ پێکەوە ڕۆژووبگرێت پێش ئەوەی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا جووت ببێت، هەرکەسێك نەیتوانی نانی شەست هەژار بدات، ئەو حوکمەمان بۆ ڕوونکردوونەتەوە بۆ ئەوەی باوەڕتان بە خوا و پێغەمبەرەکەی پتەوبێت، و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا بکەن، ئەوانە سنورەکانی خوایە مەیانبەزێنن، بێباوەڕان سزایەکی بە ئێش و ئازاریان بۆ هەیە.

ئەحمەد و بوخاری بە موعەلەقی و نەسائی و ئیبن ماجە لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((تَبَارَكَ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ كُلَّ شَيْءٍ، إِنِّي لَأَسْمَعُ كَلَامَ خَوْلَةَ بِنْتِ ثَعْلَبَةَ وَيَخْفَى عَلَيَّ بَعْضُهُ، وَهِيَ تَشْتَكِي زَوْجَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهِيَ تَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَكَلَ شَبَابِي، وَنَثَرْتُ لَهُ بَطْنِي، حَتَّى إِذَا كَبِرَتْ سِنِّي، وَانْقَطَعَ وَلَدِي، ظَاهَرَ مِنِّي، اللَّهُمَّ

إِنِّي أَشْكُو إِلَيْكَ، فَمَا بَرِحَتْ حَتَّى نَزَلَ جِبْرَائِيلُ بِهَؤُلَاءِ الْآيَاتِ: ﴿قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾، وَأما زَوجهَا فَهُوَ أَوْس بن الصَّامِت)).

واتە: بەرز و مەزنە و خێر و چاکەی فراوان و بەردەوامە ئەو خوایەی کە بیستنی فراوانە و هەموو شتێکی گرتووەتەوە، من گوێم لە قسەی خەولەی کچی سەعلەبە دەگرت و هەندێکیم لێ شاراوەبوو، کە سکاڵای پیاوەکەی دەکرد لای پێغەمبەری خوا ﷺ و دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا تەمەنی گەنجیم لەگەڵدا بەسەر برد، منداڵمی زۆرم بۆ هێناوە، هەتاکو پیر بووم و ناتوانم منداڵ بهێنم، زیهاری کردووە و جووتبوونی لەگەڵ قەدەغە کردووم و پێی گوتم: وەك دایکم وابیت، پەروەردگارا من سکاڵای مێردەکەم لای تۆ دەکەم، عائیشە دەڵێت: نەڕۆیشت هەتاکو جبریل ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾، هاوسەرەکەی ئەوسی کوڕی صامت بوو.

ئەبوداود لە خەولەی کچی مالکی کوڕی سەعلەبەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((ظَاهَرَ مِنِّي زَوْجِي أَوْسُ بْنُ الصَّامِتِ، فَجِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَشْكُو إِلَيْهِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُجَادِلُنِي فِيهِ، وَيَقُولُ: اتَّقِي اللَّهَ فَإِنَّهُ ابْنُ عَمِّكِ، فَمَا بَرِحْتُ حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ: ﴿قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا﴾، إِلَى الْفَرْضِ، فَقَالَ: يُعْتِقُ رَقَبَةً، قَالَتْ: لَا يَجِدُ، قَالَ: فَيَصُومُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ شَيْخٌ كَبِيرٌ مَا بِهِ مِنْ صِيَامٍ، قَالَ: فَلْيُطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا)).

واتە: ئەوسی کوڕی صامت هاوسەرم زیهاری لێکردم، ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای هاوسەرەکەم بکەم، پێغەمبەری خوا ﷺ مشتومڕی لەگەڵداکردم سەبارەت بە هاوسەرەکەم، دەیفەرموو: لە خوا بترسە هاوسەرەکەت کوڕی مامتە، لەو شوێنە نەڕۆیشتم هەتاکو قورئان دابەزی: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَـٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ هەتاکو ئەوەی کەفارەت بوو و لەسەری فەرزکرابوو، فەرمووی: بەندەیەك ڕزگار بکات، ئافرەتەکە گوتی: بەندەی نییە ئازادی بکات، فەرمووی: دوو مانگ پێکەوە ڕۆژوو بگرێت، ئافرەتەکەی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا پیاوێکی بەساڵاچووە ناتوانێت ڕۆژوو بگرێت، فەرمووی: خۆراکی شەست هەژار بدات، ئافرەتەکە گوتی: هیچی نییە بیبەخشێت.

تەبەری لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: یەکەم کەس کە زیهاری کرد لە هاوسەرەکەی ئەوسی کوڕی صامتی برای عوبادەی کوڕی صامت بوو، هاوسەرەکەی خەولەی کچی سەعلەبەی کوڕی مالك بوو، کاتێك پێیگوت: تۆ وەك دایکم وابیت، ترسا ئەو قسەیە تەڵاق بێت، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو زیهاری لێکردووم و ئێمە ئەگەر لەیەك جیاببینەوە تیادەچین، منداڵی زۆرم لێی هەیە، ماوەیەکی زۆرە لەگەڵیدا دەژیم، ئەوە بووەتە کێشەی و دەگری، هیچ شتێك سەبارەت بەوە نەهاتووە، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَـٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ هەتاکو ﴿وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ۝٥﴾، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد پێی فەرموو: دەتوانیت بەندەیەك ئازاد بکەیت، گوتی:

نەخێر، سوێند بە خوا ناتوانم ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ سامانی بۆ کۆکردەوە هەتاکو بەندەیەکی ئازادکرد، پاشان هاوسەرەکەی گەڕاندەوە.

ئیبن کەسیر دەڵێت: ئەوەی دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم﴾ بنەڕەتی (الظهار) لە (الظهر) واتە: پشتە، چونکە لە سەردەمی نەفامیدا کەسێك ئەگەر زیهاری لە هاوسەرەکەی بکردایە پێی دەگوت: تۆ وەك پشتی دایکمی، پاشان لە شەرعدا هەموو ئەندامەکان قیاسکراوە لەسەر پشت، زیهار لە سەردەمی نەفامیدا تەڵاق بوو، خوا ڕوخسەتی ئەم ئوممەتەیدا کەفارەتی بۆ داناون، بە تەڵاقی دانەناوە وەك سەردەمی نەفامی، ئەمە قسەی زیاتر لە زانایەکە لە زانایانی سەلەف، ئیبن ئەبوحاتەم لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: (الإيلاء) و(الظهار) تەڵاقبوون لە سەردەمی نەفامی، خوا چوار مانگی دیاریکرد بۆ ئەو کەسەی سوێند دەخوات لەگەڵ هاوسەرەکەیدا جووتنەبێت، و ئەو کەسەی بە هاوسەرەکەی دەڵێت: وەك دایکمی، کەفارەتی بۆ داناوە؛ پێشەوا مالك: ﴿مِنكُم﴾ لە ئایەتەکە کردووەتە بەڵگە کە کەسی بێباوەڕ ئایەتەکە نایگرێتەوە و خیتابەکە بۆ باوەڕدارانە، جمهور وەڵامیانداوەتەوە بەوەی ئەمە (خرج مخرج الغالب فلا مفهوم له)، جمهور: ﴿مِّن نِّسَآئِهِم﴾ کردووەتە بەڵگە بۆ ئەوەی کەنیزەك زیهاری لێناکرێت، ئەم خیتابە نایگرێتەوە، ﴿مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْۖ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔى وَلَدْنَهُمْۚ﴾ واتە: ئافرەت ئەگەر مێردەکەی پێی بڵێت: تۆ وەك دایکمی بەوە نابێتە دایکی، بەڵکو دایکی ئەو ئافرەتەیە کە لێیەوە لە دایکبووە، لەبەر

ئەوە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًا﴾ واتە: ئەوە قسەیەکی خراپ و پووچەڵە، ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ واتە: خوا لێخۆشبووە بۆ ئەوەی لە سەردەمی نەفامی ڕوویداوە، ئەمەش دیسان ئەگەر بەبێ مەبەست لە زمان دەربچێت، ئەو کەسەی قسەکە دەکات مەبەستی نەبێت، وەك ئەبوداود ڕیوایەتی کردووە، (ئەلبانی ئەم فەرموودەیەی بە زەعیف داناوە) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو بە هاوسەرەکەی دەگوت: ئەی خوشکەکەم، فەرمووی: ئەم ئافرەتە خوشکتە؟؛ ئەمە نکۆڵیکردنە و بەتەنها ئەو قسەیە هاوسەرەکەی حەرام نەکرد لەسەری، چونکە مەبەستی نەبوو، ئەگەر ئەو قسەیەی بە مەبەستەوە بکردایە هاوسەرەکەی حەرام دەبوو لەسەری، چونکە لەسەر بۆچوونی صەحیح جیاوازی نییە لە نێوان دایك و مەحرەمەکانی تر لە خوشك و پور و هاوشێوەیان.

تەبەری لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ﴾ ئەو قسەیە پیاوێك بە هاوسەرەکەی بڵێت: تۆ وەك دایکم بیت، ئەگەر ئەو قسەیەی کرد حەڵاڵ نییە نزیك بێتەوە نەبە جووتبوون و نەبە شتی تریش، هەتاکو کەفارەتی قسەکەی نەدات: ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا﴾، (المس): جووتبوونە، ﴿فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا﴾، ئەگەر بڵێت: وەك دایکم وابیت ئەگەر فلان و فلان کردەوە ئەنجام بدەیت، ئەوکاتە

ناکەوێتە زیهارەوە هەتاکو پێچەوانەی قسەکەی نەکات، ئەگەر پێچەوانەی قسەکەی کرد نزیکی نابێتەوە هەتاکو کەفارەتەکەی نەدات، لە زیهاردا تەڵاق ناکەوێت.

قەنوجی دەڵێت: ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ﴾ بەندەی نەبێت، بەهاکەشی نەبێت بیکڕێت، ﴿فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ﴾ پێویستە لەسەری دوو مانگ ڕۆژووبگرێت بە دوای یەکدا و نەیشکێنێت، ئەگەر ڕۆژێك ڕۆژوو نەگرێت بەبێ عوزر دووبارە دەبێت لەو کاتەوە دوو مانگ ڕۆژووبگرێت، بەڵام ئەگەر لەبەر عوزرێك بوو وەك نەخۆشی و سەفەرکردن سەعیدی کوڕی موسەیب و حەسەن و عەتای کوڕی ئەبورەباح و عەمری کوڕی دینار و شەعبی و شافعی و مالك دەڵێن: بەردەوام دەبێت و لەسەرەتاوە دەست پێناکاتەوە، ئەبوحەنیفە دەڵێت: لە سەرەتاوە دەست پێدەکاتەوە، لە شافعیشەوە گێڕدراوەتەوە، ﴿مِن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ﴾ مەبەست جووتبوونە بە بۆچوونی جمهور، دروست نییە بۆ ئەو کەسەی زیهار دەکات جووتبێت لەگەڵ هاوسەرەکەیدا هەتاکو کەفارەتەکەی دەدات، گوتراوە: مەبەست چێژبردنە بە جووتبوون یان دەستدان لە لەشی هاوسەرەکەی یان سەیرکردنی دامێنی بە شەهوەتەوە، ئەمە بۆچوونی مالکە و یەکێکە لە بۆچوونەکانی شافعی، ئەگەر لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بە شەو یان بە ڕۆژ بە ئەنقەست یان بە هەڵە جووتبێت، ڕۆژووگرتنەکەی لە سەرەتاوە دەست پێدەکاتەوە، ئەوە بۆچوونی ئەبوحەنیفە و مالکە، شافعی دەڵێت: لە سەرەتاوە دەست پێ ناکاتەوە ئەگەر لە شەودا لەگەڵیدا جووت نەبووبێت، چونکە شەو کاتی ڕۆژووگرتن نییە، بۆچوونی یەکەم صەحیحترە؛ سەعدی چەند حوکمێکی لەم ئایەتانە دەرهێناوە ئەمە پوختەکەیەتی،

دەڵێت: ﴿فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًاۚ﴾ نانبدات بە هەژاران بەوەی لە خۆراکی وڵاتەکەی تێریان بکات، ئەوە بۆچوونی زۆربەی ڕاڤەکارانە، یان هەر هەژارێك مشتێك گەنم یان نیو صاع خۆراك کە دەکاتە دوو مشت لە خۆراکی تریان بداتێ، لەو خۆراکانەی لە زەکاتی سەرفترەدا دەبەخشرێت، ئەوە بۆچوونی کۆمەڵێکی تر لە زانایانە، لەم ئایەتەدا کۆمەڵە حوکمێك هەیە، لەوانە: لوتفی خوا بە بەندەکانی و گرنگی پێدانیان، کاتێك باسی سکاڵای ئەم ئافرەتە دەکات، کێشەکەی بۆ چارەسەرکردووە بە حوکمێکی گشتی بۆ هەرکەسێك تووشی ئەو کێشەیە ببێت، زیهار تایبەتە بە حەرامکردنی هاوسەرەوە، چونکە خوا دەفەرموێت: ﴿مِّن نِّسَآئِهِم﴾ ئەگەر کەنیزەکەی حەرام بکات زیهار نییە، بەڵکو لە ڕەگەزی حەرامکردنی خواردن و خواردنەوەیە واجبە کەفارەتی سوێند بدات، زیهار لە ئافرەتێك ناشێت پێش ئەوەی بیخوازێت، چونکە لە هاوسەرەکانی نییە لەو کاتەی زیهار دەکات، وەك چۆن تەڵاقدانی دروست نییە، و زیهار حەرامە چونکە خوا: ﴿مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًاۚ﴾ ناوی لێناوە، خوا ئاگاداریکردنەوە و حوکمێکی پڕ دانایی بۆدان و دەفەرموێت: ﴿مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْۖ﴾، نابێت هاوسەرەکەی بە ناوی مەحارمەکانییەوە بانگ بکات و پێی بڵێت: دایکە، یان خوشکە، و پێویستە بزانرێت ئەو کەسەی زیهارەکەی کردووە چی گوتووە، دروستە بۆ کەفارەتی بەندە گەورە بێت یان بچووك، نێر بێت یان مێ، لەبەر ئەوەی ئایەتەکە بە ڕەهای هاتووە، کەفارەتەکە ئەگەر بەندە ئازادکردن بێت یان ڕۆژووگرتن بێت پێش جووتبوونە، وەك خوا وابەستەیکردووە، بە پێچەوانەی کەفارەتی نانداان بە هەژاران جووتبوون لەو نێوەندەدا دروستە، لەوانەیە

حیکمەت لە واجببوونی کەفارەت پێش جووتبوون ئەوەبێت کە پاڵنەری بێت زووتر ئەو کەفارەتە بدات کاتێك حەزی لە جووتبوون کرد لەگەڵ هاوسەرەکەی، ئەگەر بزانێت ناتوانێت ئەوە بکات هەتاکو کەفارەتەکە بەجێ نەهێنێت، پەلە دەکات لە بەجێهێنانی کەفارەتەکەی، پێویستە خۆراك بدات بە شەست هەژار، ئەگەر خۆراکی شەست هەژار کۆ بکاتەوە بیدات بە یەك هەژار یان زیاتر و کەمتربن لە شەست هەژار دروست نییە، چونکە دەفەرموێت: ﴿فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا﴾.

(وَإِنَّ آيَةَ اللِّعَانِ نَزَلَتْ فِي عويمر العجلاني أَوْ هِلَالِ بْنِ أُمَيَّةَ).

واتە: ئایەتی لیعان لەسەر عوەیمری عیجلانی یان هیلالی کوڕی ئومەیە دابەزیوە.

ئایەتەکانی لیعان ئەم ئایەتانەن کە خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٦ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ٧ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ٨ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٩﴾(النُّور).

واتە: ئەو کەسانەی هاوسەرەکانیان تۆمەتبار دەکەن بە داوێن پیسی و کەس شاهیدیان نییە جگە لە خۆیان، دەبێت چوار جار خوا بکەن بە شاهید و جەخت بکەنەوە ڕاستگۆن لەو قسەیان کە هاوسەرەکەیان تۆمەتبار دەکەن بە زیناکاری؛ جاری پێنجەم

بڵێت: نەفرەتی خوام لەسەر بێت، ئەگەر لەو کەسانەبم بە درۆوە تۆمەتی داوێنپیسی دەدەنە پاڵ هاوسەرەکانیان؛ ئافرەتەکە لە سزا ڕزگاری دەبێت ئەگەر چوار جار خوا بکات بە شاهید، جەخت بکاتەوە پیاوەکەی لەو کەسانەیە کە درۆ دەکەن لە تۆمەتبارکردنی هاوسەرەکەیان بەو تاوانە؛ جاری پێنجەم بڵێت: توڕەیی خوام لەسەر بێت، ئەگەر پیاوەکە ڕاستگۆبێت لەو تۆمەتەی دەیداتە پاڵم.

ئەگەر پیاوێك هاوسەرەکەی تۆمەتبار بکات بە زیناکاری و هیچ کەس گەواهیدەری نەبێت و هاوسەرەکەی دان بەو تاوانەدا نەنێت، پێویستە (ملاعنة) بکەن کە بەم شێوازەیە: چوار جار خوا بکات بە شاهید هاوسەرەکەی بینیوە داوێنپیسی کردووە، جاری پێنجەم دەبێت بڵێت: نەفرەتی خوام لەسەر بێت ئەگەر درۆ دەکەم لەم قسەیەم، لە بەرامبەردا هاوسەرەکەی بۆ ئەوەی سزای ڕەجمی بەسەردا نەسەپێت پێویستە چوار جار بڵێت: خوا شاهیدە پیاوەکەم درۆ دەکات و ئەوە بوختانە دەیکات، جاری پێنجەمیش دەبێت بڵێت: توڕەیی خوام لەسەر بێت ئەگەر ئەو تۆمەتەی دەیداتە پاڵم ڕاست بێت، ئیبن کەسیر دەڵێت: بە (ملاعنة) ئەو دوو هاوسەرە لە یەك جیادەبنەوە لای شافعی و زۆرێك لە زانایان، بۆ هەمیشە لەسەری حەرام دەبێت مارەی بکاتەوە و مارەییەکەی پێدەدات؛ بوخاری لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: ((أَنَّ هِلَالَ بْنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ امْرَأَتَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ بِشَرِيكِ ابْنِ سَحْمَاءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: الْبَيِّنَةَ أَوْ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِذَا رَأَى أَحَدُنَا عَلَى امْرَأَتِهِ رَجُلًا يَنْطَلِقُ يَلْتَمِسُ الْبَيِّنَةَ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: الْبَيِّنَةَ وَإِلَّا حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ، فَقَالَ هِلَالٌ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنِّي لَصَادِقٌ، فَلَيُنْزِلَنَّ اللهُ مَا يُبَرِّئُ ظَهْرِي مِنَ الْحَدِّ، فَنَزَلَ

جِبْرِيلُ وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ ۝٦﴾ فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ: ﴿إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ۝٩﴾ فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا، فَجَاءَ هِلَالٌ فَشَهِدَ، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ اللهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ، ثُمَّ قَامَتْ فَشَهِدَتْ، فَلَمَّا كَانَتْ عِنْدَ الْخَامِسَةِ وَقَّفُوهَا وَقَالُوا: إِنَّهَا مُوجِبَةٌ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَتَلَكَّأَتْ وَنَكَصَتْ، حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهَا تَرْجِعُ، ثُمَّ قَالَتْ: لَا أَفْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ الْيَوْمِ، فَمَضَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَبْصِرُوهَا، فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ، سَابِغَ الْأَلْيَتَيْنِ، خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ، فَهُوَ لِشَرِيكِ بْنِ سَحْمَاءَ، فَجَاءَتْ بِهِ كَذَلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَوْلَا مَا مَضَى مِنْ كِتَابِ اللهِ، لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأْنٌ)).

**واتە: هیلالی کوڕی ئومەیە هاوسەرەکەی تۆمەتبار کرد بە زیناکردن لەگەڵ شەریکی کوڕی سەحما لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵگە دەهێنیت یان حەد دەدرێت لە نێو شانت، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەسێك لە ئێمە ئەگەر پیاوێك لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ببینێت بڕوات بە دوای بەڵگەدا بگەڕێت، پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام دەیفەرموو: بەڵگە دەهێنیت یان حەد دەدرێت لە نێو شانت، هیلال گوتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق ناردووە من ڕاستگۆم، باخوا ئایەتم لەسەر دابەزێنێت و پشتم لە لێدانی حەد بپارێزێت، جبریل دابەزی و ئەم ئایەتانەی بەسەردا دابەزاند: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ ۝٦﴾ هەتاکو ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: ﴿إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ۝٩﴾ پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە دوای هیلال و هاوسەرەکەی، هیلال شاهیدەدا و پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بێگومان خوا دەزانێت یەکێکتان درۆ**

دەکەن، ئایا کەس لە ئێوە تەوبە دەکات؟ پاشان ئافرەتەکە هەستا و شاهیدیدا، کاتێك ویستی شاهیدی پێنجەم بدات ڕایانگرت و گوتیان: ئەم شاهیدییە حوکمی جیابوونەوە پێویست دەکات، ئیبن عەباس دەڵێت: خاوبوویەوە و گەڕایە دواوە، هەتاکو گومانمان وابوو پەشیمان دەبێتەوە، پاشان ئافرەتەکە گوتی: کەسوکارەکەم بۆ هەتاهەتایە ڕیسوا ناکەم، گەواهیدا و ڕۆیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەیری منداڵەکەی بکەن ئەگەر برۆکانی ڕەشبوون و سمتی پڕگۆشت و قاچەکانی قەڵەوبوون، ئەوە لە شەریکی کوڕی سەحمایە، کاتێك منداڵەکەی بوو، بەوشێوەیە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر لەبەر ئایەتەکانی کتێبەکەی خوا نەبووایە کە ئافرەت بە ملاعنەکردن لە سزا ڕزگاری دەبێت، من لەسەر ئەم ئافرەتە سزای حەدم دەسەپاند.

بوخاری لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدییەوە ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: ((أَنَّ عُوَيْمِرًا أَتَى عَاصِمَ بْنَ عَدِيٍّ، وَكَانَ سَيِّدَ بَنِي عَجْلَانَ، فَقَالَ: كَيْفَ تَقُولُونَ فِي رَجُلٍ وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلًا، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ، أَمْ كَيْفَ يَصْنَعُ؟ سَلْ لِي رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَأَتَى عَاصِمٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَكَرِهَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الْمَسَائِلَ، فَسَأَلَهُ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَرِهَ الْمَسَائِلَ وَعَابَهَا، قَالَ عُوَيْمِرٌ: وَاللهِ لَا أَنْتَهِي حَتَّى أَسْأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَجَاءَ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، رَجُلٌ وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلًا، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ، أَمْ كَيْفَ يَصْنَعُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قَدْ أَنْزَلَ اللهُ الْقُرْآنَ فِيكَ وَفِي صَاحِبَتِكَ، فَأَمَرَهُمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْمُلَاعَنَةِ بِمَا سَمَّى اللهُ فِي كِتَابِهِ، فَلَاعَنَهَا، ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنْ حَبَسْتُهَا فَقَدْ ظَلَمْتُهَا، فَطَلَّقَهَا، فَكَانَتْ سُنَّةً لِمَنْ كَانَ بَعْدَهُمَا فِي الْمُتَلَاعِنَيْنِ)).

واتە: عوەیمر هات بۆ لای عاصمی کوڕی عەدی کە سەرۆك هۆزی (بنوالعجلان) بوو گوتی: چی دەڵێن دەربارەی کەسێك پیاوێك لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ببینێت، ئەگەر بیکوژێت دەیکوژنەوە، یان چی بکات، دەربارەی ئەو حوکمە پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بکە، عاصم هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پرسیارەی لێکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پرسیارەی پێ ناخۆش بوو، عوەیمر پرسیاری لە عاصم کرد وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ چی بوو، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیارەکەی پێناخۆش بوو و بە عەیبی زانی، عوەیمر گوتی: وازناهێنم هەتاکو خۆم پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەم، هات و پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا پیاوێك کەسێك لەگەڵ خێزانەکەیدا دەبینێت، ئەو پیاوە بکوژێت لە بری دەیکوژنەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا دەربارەی تۆ و هاوسەرەکەت قورئانی دابەزاند، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد بە ملاعنە کە خوا لە کتێبەکەیدا بەو ناوەوە ناوی لێناوە، ملاعنەیان کرد، پاشان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر بەندی بکەم ستەمی لێدەکەم و تەڵاقیدا، ئەمەش بووە سوننەت دوای ئەوان بۆ ئەو هاوسەرانەی ئەوەیان تووش دەبێت، ملاعنەدەکەن.

قورتبی دەڵێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ﴾ گشتییە بۆ هەموو ئەو کەسانەی هاوسەرەکانیان تۆمەتباردەکەن بە زیناکردن، پێی بڵێت: زیناتکردووە، یان زیناکار، یان بینیم زینای دەکرد، یان ئەمە منداڵی من نییە، ئایەتەکە هەموو ئەمانە دەگرێتەوە،

پێویستە مولاعەنە بکەن ئەگەر چوار شاهید نەهێنێت، ئەمە بۆچوونی جمهور و زانایانی فەرمووده‌شە.

(وَأَنَّ آيَةَ الْكَلَالَةِ نَزَلَتْ فِي جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ).

واتە: ئایەتی کەلالە لەسەر جابری کوڕی عبدالله دابەزیوە.

ئایەتی کەلالە کۆتا ئایەتە لە سورەتی النسائدا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ١٧٦﴾(النِّسَاء).

واتە: داوای فەتوات لێدەکەن دەربارەی میراتی کەسێك کە دەمرێت و مندالّی نییە و باوکیشی لە ژیاندا نەماوە، بلّێ: خوا لەوبارەیەوە فەتواتان بۆ دەدات، ئەگەر کەسێك بمرێت و مندالّی نەبێت و یەك خوشکی هەبێت، نیوەی ئەو سامانەی بەمیرات بەجێی دەهێلّێت پێدەبرێت، براکەی دەبێتە میراتگری ئەو خوشکەی ئەگەر مرد و مندالّی نەبوو و هەموو سامانەکەی پێدەبرێت، ئەگەر دوو خوشك بوون دووبەش لەسیّ بەشی میراتەکەیان پێدەبرێت، ئەگەر کۆمەلّێك برا و خوشك بوون ئەوکاتە نێرینەکان دوو هێندەی مێینەکانیان پێدەبرێت، خوا ئەو حوکمەتان بۆ ڕوون دەکاتەوە بۆ ئەوەی گومڕا و سەرگەردان نەبن، خوا بە هەموو شتێك زانایە.

شەوكانی دەڵێت: ﴿ٱلۡكَلَٰلَةِۚ﴾ بریتییە لەو مردووەی كە منداڵی نییە و باوكی لە ژیاندا نەماوە، ئەمە گوتەی ئەبوبەكری صدیق و عومەر و عەلی و جمهوری زانایانیشە، ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ ١٢﴾(النِّسَاء)، ئیبن عوسەیمین دەڵێت: مەبەست لەم خوشكەی لێرە باسكراوە خوشكی دایك و باوكییە یان خوشكی باوكییە، چونكە خوا لەسەرەتای ئەم سورەتە باسی خوشكی دایكی كرد لەو ئایەتەی كە دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ ١٢﴾(النِّسَاء)؛ زانایان ناكۆكن لەو نیوەی كەلە خوشكێك یان ئەو سێ یەكەی كەلە دوو خوشك دەمێنێتەوە ئەو میراتە چی لێدەكرێت، هەندێكیان دەڵێن: دەدرێت بە خەزێنەی دەوڵەت (بیت المال)، هەندێكی تریان دەڵێن: ئەگەر مردووەكە میراتگری تری نەبوو دەگەڕێتەوە بۆ خوشكەكان، ئیبن عوسەیمین دەڵێت: ئەمەیان پەسەندترە، بوخاری و مسلم لە بەرائی كوڕی عازبەوە ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت: كۆتا ئایەت كە دابەزی ئەم ئایەتە بوو: ﴿يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ﴾، كۆتا سورەت كە دابەزی سورەتی التوبە بوو؛ بوخاری لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: كۆتا ئایەتێك كە دابەزییە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتی ڕیبا بوو؛ ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی و ترمزی لە بەرائەوە ڕیوایەتیان كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا:

﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِۚ﴾، ﴿ٱلْكَلَٰلَةِۚ﴾ چییە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایەتی هاوینت بەسە، کۆتا ئایەتی سورەتی النساء؛ بوخاری و مسلم لە جابری کوڕی عبداللەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ سەردانم من نەخۆش و بێهۆش بووم، دەستنوێژی گرت و لە ئاوی دەستنوێژەکەیان کرد بەسەرمدا، بەهۆش هاتمەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من خوشك میراتگرمە و منداڵم نییە و باوکم لە ژیاندا نەماوە، ئایەتی میرات دابەزی: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِۚ﴾؛ مسلم لە عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: دەربارەی هیچ شتێك پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکرد هێندە پرسیارم لە ﴿ٱلْكَلَٰلَةِۚ﴾ لێکرد، بە پەنجەی دای لەسەر سنگم و فەرمووی: ئەو ئایەتەت بەسە کە لە هاویندا دابەزی لە کۆتایی سورەتی النساء؛ ئەبوداود و نەسائی لە (السنن الكبرى) لە جابری کوڕی عبداللەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: نەخۆشکەوتم و حەوت خوشکم هەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کردم، فووی کرد بە ڕوخسارمدا و بەهۆش هاتمەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا وەسیەت بکەم بە سێیەکی سامانەکەم بۆ خوشکەکانم؟ فەرمووی: چاکەیان لەگەڵ بکە، گوتم: ئەی نیوەی سامانەکەم؟ فەرمووی: چاکەیان لەگەڵ بکە، پاشان دەرچوو و بەجێی هێشتم و فەرمووی: ئەی جابر من وا نابینم لەم نەخۆشییەتدا بمریت، خوا ئایەتی دابەزاند و ئەوەی بەشی خوشکەکانتە دیاریکرد، دووبەش لە سێ بەشی بۆ دیاریکردن، جابر دەیگوت: ئەم ئایەتە دەربارەی من دابەزیوە: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِۚ﴾.

(وَأَنَّ قَوْلَهُ: ﴿وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴿٤٩﴾﴾(المَائِدَة)، نَزَلَتْ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ).

واتە: ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: حوکم بکە لە نێوانیان بەوەی خوا دایبەزاندووە، دەربارەی بەنوقورەیزە و نەزیر دابەزیوە.

ئەو ئایەتە لە سورەتی المائدە دایە تەواوی ئایەتەکە خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾﴾(المَائِدَة).

واتە: حوکم بکە لە نێوانیان بەوەی خوا دایبەزاندووە کە قورئانە و شوێن حەز و ئارەزووەکانیان مەکەوە، وریایانبە تووشی فیتنەت نەکەن بەوەی ئاستەنگت بۆ دروست بکەن کردەوە بە هەندێك لە ئایەتەکانی خوا نەکەیت کە بۆی دابەزاندوویت، ئەگەر پشتیان هەڵکرد و ڕازی نەبوون بەوەی دادگەری بکەیت لە نێوانیان ئەوا بزانە بێگومان خوا دەیەوێت گرفتاریان بکات بەهۆی هەندێك لە تاوانەکانیانەوە، بەڕاستی زۆرێك لە خەڵك لادەر و لە ڕێ دەرچوون.

ئەم ئایەتە پەیوەستە بە ئایەتەکانی پێشییەوە، ئیبن ئەبوحاتەم و تەبەرانی و حاکم و بەیهەقی لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە و حاکم بە صەحیحی داناوە و زەهەبی هاوڕایەتی، دەڵێت: دوو ئایەت لەم سورەتە نەسخ کراونەتەوە: ئایەتی: (القلائد)، و

ئەوەی کە دەفەرموێت: ﴿فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ﴾ پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشك کرابوو ئەگەر بیویستایە حوکمی دەکرد لە نێوانیان، ئەگەر بیویستایە پشتی لێ هەڵدەکردن و وەڵامی نەدەدانەوە و دەیگەڕاندنەوە بۆ حوکمەکانی ئاینەکەی خۆیان، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ ﴿٤٩﴾﴾ فەرمانکرا بە پێغەمبەری خوا ﷺ حوکم بکات لە نێوانیاندا بەوەی لە قورئاندا هاتووە؛ ئەحمەد و ئەبوداود لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾﴾(المَائِدَة) خوا ئەم ئایەتانەی دابەزاند لەسەر دوو کۆمەڵ لە جوولەکەکان، کۆمەڵێکیان لەسەردەمی نەفامی سەرکەوتبوون بەسەر کۆمەڵەکەی تریاندا، ڕێککەوتبوون لەسەر ئەوەی هەرکەسێك لە کۆمەڵە خاوەن پلەوپایە و دەسەڵاتدارەکان کەسێکی لە کۆمەڵە لاواز و بێ دەسەڵاتەکە کوشت خوێنباییەکەی پەنجا وەسق گەنمە (هەر وەسقێك شەست صاعە، کەواتە: پەنجا وەسق دەکاتە سێ هەزار صاع، هەمووی دەکاتە نزیکەی شەش تەن و نیو)، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە کۆمەڵە لاواز و بێ دەسەڵاتەکە لە خاوەن پلەوپایەکانیان کوشت دەبێت سەد وەسەق گەنم بدات بە خوێنبایی، بەوشێوەیە بوون هەتاکو پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، هەردوو لایان سەرکز و ڕیسوابوون، پێغەمبەری خوا ﷺ زاڵ نەبوو بوو بەسەریاندا، لە ئاشتیدا بوو لەگەڵیان، کەسێك لە کۆمەڵە بێ دەسەڵاتەکە کەسێکی لە خاوەن پلەوپایەکانیان کوشت، پەیامی بۆ ناردن کە

سەد وەسق گەنمان بۆ بنێرن، بێ دەسەڵاتەکان گوتیان: ئایا شتی لەو شێوەیە ڕوویداوە لە نێوان دوو گەڕەك کە ئاین و ڕەچەڵەك و وڵاتیان یەك بێت، کۆمەڵێکیان خوێنبایی نیوەی کۆمەڵەکەی تریان بێت؟! ئێمە کاتێك ئەوەمان بە ئێوە دەدا ستەم و چەوسانەوە بوو لە ئێمەتان دەکرد، خەریك بوو شەڕ لە نێوانیان هەڵ بگیرسێت، پاشان ڕازی بوون کە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن بە دادگەر لە نێوانیان، پاشان دەسەڵاتدارە خاوەن پلەوپایەکانیان گوتیان: سوێند بە خوا محمد دوو هێندەی خوێنی ئەوان بە ئێوە نادات، چونکە ئێمە ئەوەمان وەك ستەم و چەوساندنەوە لێ دەسەندن، لەوەشدا ڕاستیان کرد، کەسانێکیان نارد کە لەوبارەوە هەواڵیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بباتەوە، گوتیان: ئەگەر ئەوەی دەمانەوێت پێیدان ئەوا بیکەن بە دادوەر لە نێوانتان، ئەگەرنا وریابن و مەیکەن بە دادوەر، خوا هەموو ئەوەی کە مەبەستیان بوو هەواڵی دابوو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿۞يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ ۝٤١﴾ هەتاکو ﴿وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ۝٤٧﴾ سوێند بە خوا ئەم ئایەتانە دەربارەی جوولەکەکان دابەزی.

(وَأَنَّ قَوْلَهُ: ﴿وَمَن يُوَلِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ دُبُرَهُۥٓ ۝١٦﴾(الأَنفَال)، نَزَلَتْ فِي بَدْرٍ).

واتە: ئەو فەرموودەی دەفەرموێت: هەرکەسێك پشت لە بێباوەڕان بکات و هەڵبێت؛ لە شەڕی بەدردا دابەزیوە.

ئەو ئایەتە لە سورەتی الأنفالدایە لە درێژەکەیدا دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾﴾(الأَنفَال).

واتە: هەر کەسێك لە ڕۆژێکی ئاوهادا پشت هەڵبکات و هەڵبێت، لەبەر نەخشە و پیلانی جەنگ و شەڕکردن لەجێگای ترەوە و یان بۆ یارمەتیدان و سەرخستنی کۆمەڵێکی تر نەبێت، بێگومان بە تورەیی خواوە دەگەڕێتەوە، سەرئەنجامی ئاگری دۆزەخە، خراپترین چارەنووسی هەیە.

ئەبوداود و حاکم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ﴿وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ ﴿١٦﴾﴾(الأَنفَال)، لە ڕۆژی بەدردا دابەزی.

(وَأَنَّ قَوْلَهُ: ﴿شَهَٰدَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ﴾(المَائِدَة)، نَزَلَتْ فِي قَضِيَّةِ تَمِيمِ الداري وَعَدِيِّ بْنِ بَدَاءٍ).

واتە: ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: شاهیدی بدەن لە نێوان خۆتاندا، ئەگەر کەسێکتان لەسەرە مەرگدا بوو.

ئەو ئایەتە لە سورەتی المائدە دایە لە درێژەیدا خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ شَهَٰدَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ حِينَ ٱلْوَصِيَّةِ ٱثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ

مِّنكُمْ أَوْ ءَاخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَأَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةُ ٱلْمَوْتِۚ تَحْبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعْدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ لَا نَشْتَرِي بِهِۦ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ وَلَا نَكْتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْءَاثِمِينَ ١٠٦﴾(المَائِدَة).

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە شاهیدی بدەن لە نێوان خۆتاندا، ئەگەر کەسێکتان لەسەرە مەرگدا بوو لە کاتی وەسیەتکردندا با دوو کەسی دادگەری موسڵمان بکات بە شاهید بەسەر وەسیەتەکەیەوە، ئەگەر لە سەفەردا بوون و موسڵمانتان دەستنەکەوت و تووشی بەڵای مردن بوون دوو کەسی جگە لە خۆتان بکەن بە شاهید بەسەر وەسیەتەکەتانەوە، ئەگەر گومانتان لە ڕاستگۆیی شاهیدەکان هەبوو ڕایانگرن لە دوای نوێژ و سوێند بخۆن بە خوا کە شاهیدییەکەیان بە هیچ نرخێك ناگۆڕنەوە ئەگەرچی خزمیشبن، و لەبەر خوا شاهیدی ناشارینەوە، و دڵنیابن ئەگەر شاهیدییەکەمان شاردەوە لە گوناهبارانین.

ئەم ئایەتە باسی کەسێك دەکات کە لە سەرەمەرگدا بێت، ئەگەر وەسیەتی کرد دەبێت دوو کەسی موسڵمانی دادگەر بکات بە شاهید بەسەر وەسیەتەکەیەوە، بەڵام ئەگەر لە سەفەردا بوو و تووشی بەڵای مردن هات و فریاکەوت وەسیەت بکات، بەڵام موسڵمانی دەست نەکەوێت ئەو کاتە دوو کەس کە بەردەستبن ئەگەرچی موسڵمانیش نەبن دەیانکات بە شاهید بەسەر وەسیەتەکەیەوە، ئەگەر کەسوکاری مردووەکە گومانیان لە شاهیدەکان هەبوو کە شتێکیان لە وەسیەتەکەی شاردووەتەوە، ﴿تَحْبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعْدِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ ڕایان دەگرن لە دوای نوێژ، هەندێك لە ڕاڤەکاران

دەڵێن: ئەو نوێژە عەسرە، بەپێش چاوی خەڵکەوە سوێندیان دەدەن، شاهیدەکانیش بۆ ئەستۆ پاکییان و ڕەواندنەوەی گومان لەسەریان دەبێت لەبەر خوا سوێند بخۆن و بڵێن: سوێندبێت بە خوا شاهیدییەکەمان بەهیچ نرخێك ناگۆڕینەوە و هیچ لە وەسیەتی مردووەکە لەبەر خوا ناشارینەوە ئەگەرچی خزمیشمان بێت، ئەگەر وانەبێت ئەوا بێگومان ئێمە لە تاوانبارانین؛ بوخاری لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پیاوێك لە تیرەی سەهمی هۆزی قورەیش لەگەڵ تەمیمی داری و عەدی کوڕی بەدا سەفەری کرد، پیاوە سەهمییەکە لە شوێنێك مرد کە موسڵمانی تێدا نەبوو، کاتێك پاشماوەکانی مردووەکەیان هێنایەوە، قاپێکی لە زیو دروستکراو کە بە زێڕ پەلکی دار خورمای لەسەر نەخشێندرابوو لێ ون بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندیدان، پاشان قاپەکەیان لە مەککە دۆزییەوە، گوتیان: لە تەمیم و عەدی کڕیومانە، دوو کەس لە کەسوکاری مردووەکە هەستان گوتیان: گەواهیدانی ئێمە لە پێشترە لە گەواهیدانی ئەو دوو کەسە، ئەو قاپە موڵکی کەسە مردووەکەی ئێمەیە، دەڵێت: ئەم ئایەتە لەوبارەیەوە دابەزی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَـٰدَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ﴾؛ ئەم باسەی هاوەڵی بەڕێز تەمیمی داری پێشتر گاور بووە، پێش موسڵمانبوونی ئەم ڕووداوە ڕوویداوە.

(وَقَوْلَ أَبِي أَيُّوبَ: إِنَّ قَوْلَهُ: ﴿وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ١٩٥﴾(البَقَرَة)، نَزَلَتْ فِينَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ ..، الْحَدِيثَ).

واتە: و ئەو قسەیەی ئەبوئەیوب کە دەڵێت: ئەو فەرموودەیەی خوا ﷻ کە دەفەرموێت: دەربارەی ئێمەی پشتیوانان دابەزیوە...هەتاکو کۆتای فەرموودەکە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾(البَقَرَة).

واتە: ببەخشن لە ڕێگای خوا و بە دەستی خۆتان خۆتان بەرەو تیاچوون مەبەن و چاکەکاربن، چونکە بەڕاستی خوا چاکەکارانی خۆش دەوێت.

ئەبوداود و حاکم و ئیبن ئەبوحاتەم لە ئەسلەمی کوڕی ئەبوعیمرانەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ئێمە لە قوستەنتینیە (ئەستەمبوڵی ئێستا) بووین، والی ئەهلی میسر عوقبەی کوڕی عامر بوو، فوزالەی کوڕی عوبێد والی ئەهلی شام بوو، لە شارەکەوە سوپایەکی گەورەی ڕۆمی بەڕیز دەرچوون، ئێمەی موسڵمانانیش بەڕیزێکی گەورە بەرامبەریان وەستاین، موسڵمانێك هەڵیکوتایە سەر ڕۆمییەکان و چووە نێو ڕیزەکەیان، پاشان گەڕایەوە بۆ لامان، خەڵك هاواریان کرد گوتیان: پاك و بێگەردی بۆ خوا! ئەو پیاوە نەفسی خۆی بەرەو تیاچوون و فەوتان برد، ئەبوئەیوبی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی خەڵکینە ئێوە لێکدانەوەیەکی هەڵە بۆ ئەم ئایەتە دەکەن، ئەو ئایەتە لەسەر ئێمەی پشتیوانان دابەزی کاتێك خوا ئاینەکەی سەرخست و شوێنکەوتووانی زۆر بوون، لە نێوان خۆماندا بەبێ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بزانێت گوتمان: سامانەکانمان تیاچوو خۆزگە دابنیشین و ئەوەی تێکچووە چاکی بکەینەوە، خوا لە کتێبەکەیدا وەڵامی ئەوەی دایەوە کە ویستمان و

فەرمووی: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ﴾، تیاچوون و فەوتان ئەوە بوو کە ویستمان لەسەر ماڵ و سامانمان دابنشین و ئەوەی خراپ بووە چاکی بکەینەوە، فەرمانمان پێکرا بە شەڕکردن، لەبەر ئەوە بەردەوام ئەبو ئەیوب لە پێناوی خوادا دەجەنگا هەتا وەفاتی کرد؛ واحیدی و تەبەرانی و بەیهەقی لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: کەسی واهەبوو تاوانی دەکرد و دەیگوت: خوا لێم خۆش نابێت، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ﴾؛ دیسان واحیدی و ئیبن حبان لە ئەبوجبیرەی کوڕی زەحاکەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پشتیوانان دەیانبەخشی و خێر و چاکەیان دەکرد چەندە خوا بیویستایە، هەتاکو تووشی قاتووقڕی بوونەوە دەستیان گرتەوە، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾.

(وَنَظَائِرُ هَذَا كَثِيرٌ مِمَّا يَذْكُرُونَ أَنَّهُ نَزَلَ فِي قَوْمٍ مِنْ الْمُشْرِكِينَ بِمَكَّةَ أَوْ فِي قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى، أَوْ فِي قَوْمٍ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ؛ فَالَّذِينَ قَالُوا ذَلِكَ لَمْ يَقْصِدُوا أَنَّ حُكْمَ الْآيَةِ مُخْتَصٌّ بِأُولَئِكَ الْأَعْيَانِ دُونَ غَيْرِهِمْ؛ فَإِنَّ هَذَا لَا يَقُولُهُ مُسْلِمٌ وَلَا عَاقِلٌ عَلَي الْإِطْلَاقِ).

واتە: هاوشێوەی ئەمانە زۆرە کاتێك باسی ئەوە دەکەن ئەمە دەربارەی ئەو کۆمەڵە هاوبەش بڕیاردەرانە دابەزیوە، یان لەسەر خاوەن کتێبەکان (جوولەکە و گاور) دابەزیوە، یان دەربارەی کۆمەڵی موسڵمانان دابەزیوە، ئەوانەی ئەو قسەیان کردووە

مەبەستیان ئەوە نییە حوکمی ئایەتەکە تایبەتە بەو کەسانەوە و کەسانی تر ناگرێتەوە، چونکە ئەو قسەیە موسڵمان و هیچ عاقڵێك بە ڕەهایی نایکات.

(وَالنَّاسُ وَإِنْ تَنَازَعُوا فِي اللَّفْظِ الْعَامِّ الْوَارِدِ عَلَي سَبَبٍ هَلْ يَخْتَصُّ بِسَبَبِهِ أَمْ لَا؟ فَلَمْ يَقُلْ أَحَدٌ مِنْ عُلَمَاءِ الْمُسْلِمِينَ أَنَّ عمومات الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ تَخْتَصُّ بِالشَّخْصِ الْمُعَيَّنِ وَإِنَّمَا غَايَةُ مَا يُقَالُ إنَّهَا تَخْتَصُّ بِنَوْعِ ذَلِكَ الشَّخْصِ فَيَعُمُّ مَا يُشْبِهُهُ وَلَا يَكُونُ الْعُمُومُ فِيهَا بِحَسَبِ اللَّفْظِ).

واتە: خەڵك ئەگەرچی ناکۆکبن دەربارەی لەفزێکی گشتی کە لەسەر هۆکارێکی تایبەت دابەزیوە، ئایا تایبەتمەندە بەهۆکارەکەیەوە یان نا؟ کەس لە زانایانی موسڵمانان نەیگوتووە حوکمە گشتییەکانی قورئان و سوننەت تایبەتە بە کەسێکی دیاریکراوەوە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە دەگوترێت ئەو حوکمە تایبەتە بەو جۆرە کەسانەوە، هەموو ئەو کەسانەی هاوشێوەی ئەون دەیانگرێتەوە، و گشتگیری تێیدا بە گوێرەی لەفزەکە نییە.

(وَالْآيَةُ الَّتِي لَهَا سَبَبٌ مُعَيَّنٌ إنْ كَانَتْ أَمْرًا وَنَهْيًا فَهِيَ مُتَنَاوِلَةٌ لِذَلِكَ الشَّخْصِ وَلِغَيْرِهِ مِمَّنْ كَانَ بِمَنْزِلَتِهِ، وَإِنْ كَانَتْ خَبَرًا بِمَدْحِ أَوْ ذَمٍّ فَهِيَ مُتَنَاوِلَةٌ لِذَلِكَ الشَّخْصِ وَغَيْرِهِ مِمَّنْ كَانَ بِمَنْزِلَتِهِ أَيْضًا).

واتە: ئایەتێك کە هۆکارێکی دیاریکراوی هەیە ئەگەر فەرمان و یاساغی بێت، ئەو کەسە و کەسانی تر کە هاوشێوەی ئەوە دەیانگرێتەوە، و ئەگەر هەواڵێك بێت ستایش و پیاهەڵدان بێت یان بە خراپە باسکردن ئەو کەسە و کەسانی تری هاوشێوەی دەگرێتەوە دیسان.

(وَمَعْرِفَةُ "سَبَبِ النُّزُولِ" يُعِينُ عَلَي فَهْمِ الْآيَةِ فَإِنَّ الْعِلْمَ بِالسَّبَبِ يُورِثُ الْعِلْمَ بِالْمُسَبِّبِ؛ وَلِهَذَا كَانَ أَصَحُّ قَوْلَيْ الْفُقَهَاءِ أَنَّهُ إذَا لَمْ يُعْرَفْ مَا نَوَاهُ الْحَالِفُ رُجِعَ إلَي سَبَبِ يَمِينِهِ وَمَا هَيَّجَهَا وَأَثَارَهَا).

واتە: زانینی هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتنی ئایەتەکە، چونکە زانینی هۆکارەکە زانستی ئەوەی هۆکاربووە بەرهەم دەهێنێت؛ لەبەر ئەوە صەحیحترین بۆچوون لەو دوو بۆچوونەی شەرعزانان ئەوەیە ئەگەر نەزانرا نییەتی سوێندخۆر چییە، دەگەڕێنەوە بۆ هۆکاری سوێندخواردنەکەی و چی پاڵنەری بووە و کاریگەری چی بووە.

ئەگەر کەسێك سوێندی خواردبێت لەسەر شتێك نەزانرێت نییەتی چی بووە و لەسەر چی سوێندی خواردووە، سۆراغی ئەو پاڵنەرانە دەکرێت کە هۆکاری سوێندخواردنەکەیە، و چی بووەتە هۆکاری هەڵچوون و یان تورەبوونی و ئەو سوێندەی خواردووە، ئەمە نموونەیەکە شێخی ئیسلام هێناویەتییەوە بۆ ڕوونکردنەوەی زانینی هۆکاری دابەزینی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز کە یارمەتیدەرێکی باشە بۆ تێگەیشتن لە مانا و مەبەستی ئایەتەکە، بەڵام ئەگەر بە بەڵگەیەکی ڕوون نەبێت ئایەتەکە تایبەت ناکرێت بەو هۆکارەی لەسەری دابەزیوە، ئەم بووەتە ڕێسا بەشێوەیەکی گشتی: (العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب)، واتە: عیبرەت بە گشتییەتی لەفزەکەیە نەوەك بەتایبەتی هۆکار؛ هەندێك لە ڕاڤەکاران لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتە: ﴿ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ

﴿فَإِن لَّمۡ تَعۡلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡۚ وَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٞ فِيمَآ أَخۡطَأۡتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتۡ قُلُوبُكُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمًا ٥﴾(الأَحْزَاب).

**واتە: بە ناوی باوکی خۆیانەوە بانگیان بکەن ئەوە دادگەرانەترە لای خوا، ئەگەر نەتانزانی باوکیان کێیە ئەوا براتانن لە ئایندا و مەولاتانن، تاوانتان لەسەر نییە لەوەی بەهەڵەدا چوون، بەڵام لەوەدا تاوانبارن کە بە ئەنقەست لە دڵتانەوە ئەنجامیدەدەن، خوا لێخۆشبووە و پۆشەری تاوانە و بە بەزەییە.**

**باسی بەسەرهاتی سالمی مەولای ئەبوحوزەیفەیان کردووە و دەڵێن:** ((أن أبا حُذيفة بنَ عُتْبَةَ بنِ ربيعة بنِ عبد شمسٍ كان تبنَّى سالمًا وأنكحه ابنةَ أخيه هندَ بنتَ الوليد ابنِ عُتبة بن رَبيعة، وهو مولى لامرأة من الأنصارِ، كما تبنَّى رسولُ الله ﷺ زيدًا - وكان من تبنى رجلًا في الجاهلية دعاه الناسُ إليه ووُرِّث ميراثَه، حتى أنزلَ الله ﷻ في ذلك: ﴿ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ﴾ إلي قوله: ﴿فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡۚ﴾، فَرُدُّوا إلى آبائهم، فمن لم يُعلَم له أبٌ كان مولًى وأخًا في الدين - فجاءت سهلةُ بنتُ سهيل بنِ عمرو القُرشيّ ثم العامِريّ، وهي امرأةُ أبي حُذيفة، فقالت: يا رسولَ اللّهَ، إنا كُنا نرى سالمًا ولدًا، وكان يأوي معي ومَعَ أبي حذيفة في بيتٍ واحدٍ، ويراني فُضُلًا، وقد أنزلَ الله فيهم ما قد عَلِمتَ، فكيف ترى فيه؟ فقال لها النبيُّ ﷺ: أرضعِيه، فأرضعته خمسَ رضعاتٍ، فكان بمنزلة وَلَدِها مِن الرَّضاعة))[١].

**واتە: ئەو باسە تایبەت نییە بە سالمەوە بەڵکو هەرکەسێکی تری هاوشێوەی ئەو بێت هەمان حوکمی هەیە، بوخاری و مسلم و ئەبوداود لە عائیشە و ئوم سەلەمەوە ڕیوایەتیان**

(١). أخرجه البخاري.

کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە ئەمە لەفزی ئەبوداودە، دەڵێن: ئەبوحوزەیفە سالمی تەبەنیکرد (کردییە کوڕی خۆی) هندی کچی وەلیدی برازای لیٚ مارەکرد، سالم مەولای ئافرەتێکی ئەنصاری بوو، وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ زەیدی تەبەنیکردبوو، لەسەردەمی نەفامیدا هەرکەسێك کەسێکی تەبەنی بکردایە خەڵك بەناوی ئەوەوە بانگیان دەکرد و میراتی لێدەگرت، هەتاکو خوا دەربارەی ئەوە ئایەتی دابەزاند و فەرمووی: ﴿ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ﴾ هەتاکو: ﴿فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡۚ﴾ گەڕێندرانەوە بۆ باوکی خۆیان، هەرکەسێك باوکیان نەزانرایە دەبووە مەولا و برای ئاینی، سەهلەی کچی سوهەیلی کوڕی عەمری قورەیشی هاوسەری ئەبوحوزەیفە هات و گوتی: ئێمە سالممان بە کوڕی خۆمان دەزانی و لەگەڵ من و ئەبوحوزەیفە لەیەك ماڵدا دەمایەوە و دەمبینێت، خوا ئەوەی دەربارەیان دابەزاندووە کە دەیزانیت، چی بکەین، فەرمووی: شیری بدەریٚ، پێنج جار شیری پێدا، بەوەش وەك منداڵیانی لێهات لە شیرەوە.

(وَقَوْلُهُمْ نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي كَذَا يُرَادُ بِهِ تَارَةً أَنَّهُ سَبَبُ النُّزُولِ وَيُرَادُ بِهِ تَارَةً أَنَّ ذَلِكَ دَاخِلٌ فِي الْآيَةِ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ السَّبَبُ كَمَا تَقُولُ عَنَى بِهَذِهِ الْآيَةِ كَذَا).

واتە: ئەوەی دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو شتە دابەزیوە، جارێك مەبەست ئەوەیە هۆکاری دابەزینی ئایەتەکەیە، جارێك مەبەست ئەوەیە ئایەتەکە دەیگرێتەوە، ئەگەر هۆکاری دابەزینەکەشی نەبێت، وەك ئەوەی دەڵێت: مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە.

ئەو دەقانەی لە هاوەڵانەوە هاتووە سەبارەت بەهۆکاری دابەزینی ئایەتەکان دەبێتە سێ بەشەوە، یەکەم: ڕاشکاوە کە هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە ئەو هۆکارەکەی بووە، وەك ئەوەی هاوەڵێك بڵێت: ئەم ئایەتە لەوبارەیەوە دابەزیوە، بۆ نموونە: تەبەری لە ئەبوعەمارەوە ڕیوایەتی کردووە و وادعی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: (عن ابنِ عبّاسٍ أنَّه كرِه الإخصاءَ وقالَ فيه نزلت: ﴿وَلَأٓمُرَنَّهُمۡ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلۡقَ ٱللَّهِۚ ١١٩﴾(النِّسَاء).

واتە لە ئیبن عەباس رضي الله عنهما خەساندنی ئاژەڵی پێ ناخۆشە بووە و دەیگوت: ﴿وَلَأٓمُرَنَّهُمۡ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلۡقَ ٱللَّهِۚ ١١٩﴾(النِّسَاء)، لەوبارەیەوە دابەزیوە.

خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلۡقُرۡءَانُ تُبۡدَ لَكُمۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَاۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ١٠١﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە پرسیار مەکەن دەربارەی شتانێك کە ئەگەر ڕوون ببێتەوە و بۆتان دەرکەوێت پێتان ناخۆش دەبێت و دڵتەنگتان دەکات، ئەگەر پرسیاری لەبارەوە بکەن کاتێك قورئان دادەبەزێت بۆتان ڕوون دەبێتەوە، ئەوەی پێشتر پرسیارتان کردووە خوا لێتان خۆش دەبێت، خوا لێخۆشبوو و پۆشەری تاوانە و لێبوردەیە و بەپەلە نییە لە سزادانی سەرپێچیکاران.

بوخاری لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كانَ قَوْمٌ يَسْأَلُونَ رَسولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم اسْتِهْزاءً، فيَقولُ الرَّجُلُ: مَن أبِي؟ ويقولُ الرَّجُلُ تَضِلُّ ناقَتُهُ: أيْنَ ناقَتِي؟ فأنْزَلَ اللَّهُ فيهم هذِه الآيَةَ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن

تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٠١﴾)).

واتە: کەسانێك هەبوون بە گاڵتەجارییەوە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، یەکێکیان دەیگوت: باوکم کێیە؟، یەکێکی تریان دەیگوت: حوشترەکەم کە ون بووە لە کوێیە؟ خوا ئەم ئایەتەی دەربارەیان دابەزاند.

مسلم لە ئەنەسەوە رضي الله عنه ریوایەتی کردووە دەڵێت: ((بَلَغَ رَسولَ اللهِ ﷺ عن أَصْحابِهِ شيءٌ فَخَطَبَ فَقالَ: عُرِضَتْ عَلَيَّ الجَنَّةُ والنّارُ، فَلَمْ أَرَ كالْيَومِ في الخَيْرِ والشَّرِّ، ولو تَعْلَمُونَ ما أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا، قالَ: فَما أَتى على أَصْحابِ رَسولِ اللهِ ﷺ يَوْمٌ أَشَدُّ منه، قالَ: غَطَّوْا رُؤُوسَهُمْ وَلَهُمْ خَنِينٌ، قالَ: فَقامَ عُمَرُ فَقالَ: رَضِينا باللَّهِ رَبًّا، وَبالإسْلامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، قالَ: فَقامَ ذاكَ الرَّجُلُ فَقالَ: مَن أَبِي؟ قالَ: أَبُوكَ فُلانٌ، فَنَزَلَتْ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی پێگەیشت لە هاوەڵانییەوە کە پێی ناخۆش بوو، گوتاری بۆ خوێندنەوە و فەرمووی: بەهەشت و دۆزەخم پیشاندرا، هەرگیز وەك ئەمڕۆ چاکە و خراپەم نەبینیوە، ئەگەر ئەوەی من دەیزانم بتانزانیایە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان، ئەنەس دەڵێت: هیچ ڕۆژێك وەك ئەو ڕۆژە نارەحەتی بەسەر هاوەڵاندا نەهاتووە، سەریان داپۆشی و دەنگی گریانیان لێ دەبیسترا، عومەر هەستا گوتی: ڕازین خوا پەروەردگارمان بێت، ئیسلام ئاینمان بێت، محمد پێغەمبەرمان بێت، عبداللەی کوڕی حوزافە گوتی: باوکم کێیە؟ فەرمووی: باوکت فلانە کەسە، ئەم ئایەتە دابەزی.

ئیبن حبان لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَطَبَ فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللهَ قَدِ افْتَرَضَ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ، فَقَامَ رَجُلٌ، فَقَالَ: أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: فَسَكَتَ عَنْهُ حَتَّى أَعَادَهَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالَ: لَوْ قُلْتُ نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، وَلَوْ وَجَبَتْ مَا قُمْتُمْ بِهَا، ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، فَإِنَّمَا هَلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ، وَاخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَاجْتَنِبُوهُ، وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ، فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَذَكَرَ أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ الَّتِي فِي الْمَائِدَةِ نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ گوتاری خوێند و فەرمووی: ئەی خەڵکینە بێگومان خوا حەجی لەسەر فەرزکردوون، کەسێك هەستا گوتی: هەموو ساڵێك ئەی پێغەمبەری خوا؟، وەڵامی نەدایەوە هەتاکو سێ جار دووبارەی کردەوە، فەرمووی: ئەگەر بمگوتایە بەڵێ، فەرز دەبوو لەسەرتان، ئەگەر فەرز بووایە نەتان دەتوانی ئەنجامی بدەن، وازم لێ بهێنن بەوەی کە بۆتانم دیاری کردووە، چونکە بێگومان ئەوانەی پێش ئێوە تیاچوون بەهۆی زۆر پرسیار کردن و ناکۆکییانەوە لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان، ئەگەر یاساغی شتێکم لێکردن لێی دوورکەونەوە، ئەگەر فەرمانم بە شتێك پێکردن بە گوێرەی توانا ئەنجامی بدەن، ئەبوهورەیرە باسی ئەوەی کرد ئەم ئایەتە لەوبارەیەوە دابەزیوە.

دووەم: ڕاشکاو نەبێت و دەربڕینەکە بە لەفزێك بێت مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە، بۆ نموونە ئەو ئایەتەی خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ٣٣﴾(فُصِّلَت).

واتە: کێ لەو کەسە قسەی جوانترە کە بانگەواز بکات بۆ لای خوا بۆ ئەوەی بەتەنها بیپەرستن و کردەوەی باش ئەنجام بدات، بڵێت: بێگومان من لە موسڵمانانم و ملکەچی فەرمانەکانی پەروەردگارم.

ئیبن ئەبو شەیبە لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ٣٣﴾ ئەم ئایەتە لەسەر ئەو کەسانە دابەزیوە کە بانگ خوێنن، تەبەرانی لە (الدعاء) لە عیکرمەوە ڕیواتی کردووە دەڵێت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾ بانگ خوێنە کاتێك دەڵێت: (لا إله إلا الله).

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ٣٧﴾(النُّور).

واتە: پیاوانێك بازرگانی و کڕین و فرۆشتن سەرقاڵ و بێئاگایان ناکات لە بەجێهێنانی نوێژەکان بەوشێوەیەی فەرمانیان پێکراوە، و لە بەخشینی زەکاتی سامانەکانیان، دەترسن لە ڕۆژێك کە تێیدا دڵەکان و چاوەکان وەردەچەرخێن.

تەبەری و ئیبن ئەبوحاتەم لە سالمەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ئیبن عومەر لە بازاڕ بوو قامەتکرا بۆ نوێژ دوکانەکانیان داخست و ڕۆیشتن بۆ مزگەوت، ئیبن عومەر گوتی: ئەم ئایەتە: ﴿رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾ لەسەر ئەم جۆرە کەسانە دابەزیوە؛ بوخاری دەڵێت: ئەو فەرموودەیەی خوای پەروەردگا: ﴿رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾، قەتادە دەڵێت: کەسانێك بوون بازرگانییان دەکرد، بەڵام ئەگەر مافێك لە مافەکانی خوایان بۆ پێش بهاتایە، نەبازرگانی و نەکڕین و فرۆشتن سەرقاڵی نەدەکردن لە یادی خوا، هەتاکو مافەکەی خوایان بەجێ دەهێنا.

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾(النِّسَاء).

واتە: نەخێر سوێند بە پەروەردگارت باوەڕیان نییە هەتاکو تۆ نەکەن بە دادوەر بۆ هەرکێشە و مشتومڕێك کە ڕوودەدات لە نێوانیاندا، پاشان نابێت لە دەروونیاندا سەغڵەتبن و ئەو بڕیارەیان پێناخۆش بێت کە دەرتکردووە، بەڵکو دەبێت بە تەواوی ڕازیبن و ملکەچی بڕیارەکانتبن.

بوخاری و مسلم لە عورووەی کوڕی زوبێرەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((أنَّ رَجُلًا مِنَ الأنْصارِ خاصَمَ الزُّبَيْرَ عِنْدَ النبيِّ ﷺ في شِراجِ الحَرَّةِ، الَّتي يَسْقُونَ بها النَّخْلَ، فَقالَ الأنْصارِيُّ: سَرِّحِ الماءَ يَمُرُّ، فأبَى عليه؟ فاخْتَصَما عِنْدَ النبيِّ ﷺ، فَقالَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ لِلزُّبَيْرِ: أَسْقِ يا زُبَيْرُ، ثُمَّ أَرْسِلِ الماءَ إلى جارِكَ، فَغَضِبَ الأنْصارِيُّ، فَقالَ: أَنْ كانَ ابْنَ عَمَّتِكَ؟ فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قالَ: اسْقِ يا زُبَيْرُ، ثُمَّ

احْبِسِ الماءَ حتّى يَرْجِعَ إلى الجَدْرِ، فَقالَ الزُّبَيْرُ: واللَّهِ إنِّي لَأَحْسِبُ هذِه الآيَةَ نَزَلَتْ في ذلكَ :﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾)).

واته: زوبێر و پیاوێك له پشتیوانان بوو به دەمەقاڵەیان لەسەر جۆگە ئاوێك، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی زوبێر ئاودێری بکە و خێرا ئاوەکە بۆ دراوسێکەت ڕابدە، پشتیوانەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەبەر ئەوەی زوبێر کوڕە پورتە؟! ڕوخساری پێغەمبەری خوا ﷺ گۆڕا، پاشان فەرمووی: ئەی زوبێر ئاودێری خۆت بکە، پاشان ئاوەکە بگرەوە هەتاکو جۆگەلەکان سەرپڕدەبن و درەختەکانت تێرئاودەبن، پاشان ئاوەکە بۆ دراوسێکەت ڕابدە، پێغەمبەری خوا ﷺ مافی زوبێری بە تەواوی دا کاتێك پشتیوانەکە توڕەی کرد، پێش ئەوە پێشنیاری ئەوەی بۆ کردن کە بواری هەبوو بۆ یارمەتیدان، زوبێر گوتی: سوێند بە خوا گومانم وایە ئەم ئایەتە لەبارەی ئەو کێشەیەوە دابەزی: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾.

ئیبن عوسەیمین جۆرێکی تری زیاد کردووە دەڵێت: دەربڕینەکە بەشێوەیەك بێت ئیحتمال هەڵبگرێت وەك ئەوەی بڵێت: (نزلت في كذا)[1].

(وَقَدْ تَنَازَعَ الْعُلَمَاءُ فِي قَوْلِ الصَّاحِبِ: نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي كَذَا هَلْ يَجْرِي مَجْرَى الْمُسْنَدِ كَمَا يَذْكُرُ السَّبَبَ الَّذِي أُنْزِلَتْ لِأَجْلِهِ أَوْ يَجْرِي مَجْرَى التَّفْسِيرِ مِنْهُ الَّذِي لَيْسَ بِمُسْنَدٍ؟).

(١). (شرح مقدمة أصول التفسير)(٤٨).

واتە: زانایان ناكۆكن دەربارەی گوتەی هاوەڵ ئەگەر بڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر ئەوە دابەزیوە، ئایا وەك فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ وەك چۆن باسی ئەو هۆكارە دەكات كە ئایەتەكە لەبەر ئەوە دابەزیوە، یان وەك تەفسیری هاوەڵەكەیە و حوكمی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ نییە.

(فَالْبُخَارِيُّ يُدْخِلُهُ فِي الْمُسْنَدِ وَغَيْرُهُ لَا يُدْخِلُهُ فِي الْمُسْنَدِ، وَأَكْثَرُ الْمَسَانِدِ عَلَي هَذَا الِاصْطِلَاحِ كَمُسْنَدِ أَحْمَد وَغَيْرِهِ؛ بِخِلَافِ مَا إذَا ذَكَرَ سَبَبًا نَزَلَتْ عَقِبَهُ فَإِنَّهُمْ كُلَّهُمْ يُدْخِلُونَ مِثْلَ هَذَا فِي الْمُسْنَدِ).

واتە: بوخاری لە ڕیزی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایناوە، بەڵام جگە لە ئەو لە ڕیزی فەرموودە دایاننەناوە، و زۆربەی موسنەدەكان ڕەچاوی ئەم زاراوەیە دەكەن، وەك موسنەدی ئەحمەد و جگە لەویش، بەپێچەوانەوە ئەگەر هۆكارێك باس بكات ئایەتەكە دوای ئەوە دابەزی بێت، هەموویان هاوشێوەی ئەمە لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ دادەنێن.

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: ئەگەر هاوەڵێك بڵێت: (نزلت في كذا) ئەگەر بە فەرموودەی مەرفوعی دابنێن مانای ئەوەیە ئەو كردارە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕویداوە و ئایەتەكە وەك تەفسیرێك لەسەر ئەو ڕووداوە دابەزیوە، یان حیكمەتی ئەو ڕووداوەی ڕوونكردووەتەوە، بەڵام ئەگەر بە فەرموودەی مەرفوعی دانەنێن ئەوە تەفسیر و

لێکدانەوەی هاوەڵەکەیە بۆ ئایەتەکە، لەوانەیە صەواب بێت و لەوانەشە هاوەڵی تر پێچەوانەی بێت[١].

صالح ئال الشیخ دەڵێت: حاکم لە (المستدرك) لە (کتاب التفسیر) قسەیەکی گرنگی هەیە دەڵێت: (قسەی هاوەڵ کە ئامادە و شاهیدی دابەزینی وەحی بووە بڵێت: (نزلت في کذا) فەرموودەیەکی موسنەدە، واتە: مەرفوعە، چونکە شاهیدی دابەزینی ئایەتەکە بووە... مەبەست لە موسنەد ئەوەیە ئەوەی دەیگێڕێتەوە دەیگەیەنێت بەپێغەمبەری خوا ﷺ بە قسە یان ئەو کاتەی پێغەمبەری خوای ﷺ تێدا زیندووبووە و وەحی بۆ دابەزیوە)[٢].

(وَإِذَا عُرِفَ هَذَا؛ فَقَوْلُ أَحَدِهِمْ: نَزَلَتْ فِي كَذَا، لَا يُنَافِي قَوْلَ الْآخَرِ نَزَلَتْ فِي كَذَا إِذَا كَانَ اللَّفْظُ يَتَنَاوَلُهُمَا كَمَا ذَكَرْنَاهُ فِي التَّفْسِيرِ بِالْمِثَالِ؛ وَإِذَا ذَكَرَ أَحَدُهُمْ لَهَا سَبَبًا نَزَلَتْ لِأَجْلِهِ وَذَكَرَ الْآخَرُ سَبَبًا؛ فَقَدْ يُمْكِنُ صِدْقُهُمَا بِأَنْ تَكُونَ نَزَلَتْ عَقِبَ تِلْكَ الْأَسْبَابِ، أَوْ تَكُونَ نَزَلَتْ مَرَّتَيْنِ مَرَّةً لِهَذَا السَّبَبِ وَمَرَّةً لِهَذَا السَّبَبِ).

واتە: ئەگەر ئەوە زانرا؛ قسەی کەسێکیان کە دەڵێت: لەبارەی ئەوەوە دابەزیوە، پێچەوانە نییە لەگەڵ کەسێکی تریان کە دەڵێت: لەبارەی ئەوەوە دابەزیوە، ئەگەر لەفزەکە هەردووکیان بگرێتەوە، وەك لە جۆری تەفسیری بە نموونە باسمان کرد، و ئەگەر کەسێکیان هۆکارێکی باسکرد گوتی: لەبەر ئەوە دابەزیوە، کەسێکی تریان باسی

(١). (شرح مقدمة أصول التفسير)(٤٩).
(٢). (شرح مقدمة أصول التفسير)(٤٧).

هۆكارێكی تری كرد، دەشێت هەموویان ڕاستبن بەهۆی ئەوەی دوای ئەو هۆكارانە دابەزی بێت، یان دووجار دابەزی بێت جارێك لەبەر ئەو هۆكارە، و جارێك لەبەر هۆكارەكەی تر.

ئەگەر دوو هاوەڵ دوو هۆكاری جیاواز بۆ دابەزینی ئایەتێك باس بكەن ئەگەر ئایەتەكە هەڵبگرێت دەگوترێت لەبەر ئەو دوو هۆكارە دابەزیوە، یان یەكێكیان هۆكاری دابەزینی ئایەتەكەیە، هاوەڵەكەی تر بە نموونە ئایەتەكەی تەفسیركردووە و دەڵێت: ئەم ئایەتە لەوبارەیەوە دابەزیوە، بۆ نموونە ئەو ئایەتەی خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ ٢٢٣﴾(البَقَرَة).

واتە: خێزانەكانتان كێڵگەی ئێوەن و جێگای چاندنی تۆوەكانتانن چۆن ویستتان جووتبن لەگەڵیان بە مەرجێ لە شوێنی منداڵبوونیانەوە بێت.

بوخاری و مسلم لە جابری كوڕی عبداللەوە ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت: ((أَنَّ يَهُودَ كَانَتْ تَقُولُ إِذَا أُتِيَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ دُبُرِهَا فِي قُبُلِهَا ثُمَّ حَمَلَتْ كَانَ وَلَدُهَا أَحْوَلَ، قَالَ فَأُنْزِلَتْ: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ ٢٢٣﴾(البَقَرَة).

واتە: جوولەكە دەیانگوت: ئەگەر پیاو لە پشتەوە جووتبوونی لەگەڵ پێشی خێزانەكەیدا كرد منداڵەكەیان خێل دەبێت ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ﴾.

ترمزی و ئیبن ماجه له ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((أُوحِيَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ﴾، يقول: ((أَقْبِلْ وَأَدْبِرْ وَاتَّقِ الدُّبُرَ وَالْحَيْضَةَ)).

واتە: وەحیکرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ﴾، فەرمووی: لە پشتەوە یان لە پێشەوە جووتبن لەگەڵ خێزانەکانتان بەمەرجێك جووتبوونەکە لە دامێن و شوێنی منداڵبوونی خێزانەکەیەوە بێت.

ئەبوداود لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((كانَ هذا الحيُّ منَ الأنصارِ، وَهُم أَهْلُ وثَن معَ هذا الحيِّ من يَهودَ وَهُم أَهْلُ كتابٍ وَكانوا يرونَ لَهُم فضلًا علَيهِم في العلمِ فَكانوا يقتَدونَ بِكَثيرٍ من فعلِهِم وَكانَ من أمرِ أَهْلِ الكتابِ أن لا يَأتوا النِّساءَ إلّا على حرفٍ، وذلِكَ أستَرُ ما تَكونُ المرأةُ فَكانَ هذا الحيُّ منَ الأنصارِ قد أخَذوا بذلِكَ من فعلِهِم وَكانَ هذا الحيُّ من قُرَيْشٍ يَشرَحونَ النِّساءَ شَرحًا مُنكرًا ويتلذَّذونَ منهنَّ مُقْبِلاتٍ ومُدْبِراتٍ ومستقليات فلمّا قدِمَ المُهاجرونَ المدينةَ تزوَّجَ رجلٌ منهمُ امرأةً منَ الأنصارِ فذَهَبَ يصنَعُ بِها ذلِكَ فأنكَرتهُ علَيهِ وقالت إنَّما كنّا نُؤتى على حرفٍ فاصنَع ذلِكَ وإلّا فاجتَنِبني حتّى شريَ أمرُها فبلغَ ذلِكَ رسولَ اللَّهِ ﷺ فأنزلَ اللَّهُ عزَّ وجلَّ: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ۝٢٢٣﴾(البَقَرَة)؛ أَي: مُقْبِلاتٍ ومُدْبِراتٍ ومستَلقياتٍ يعني بذلِكَ موضعَ الولدِ)).

واتە: پشتیوانان لە مەدینە کە بت پەرستبوون لەگەڵ کۆمەڵە جوولەکەیەك دەژیان کە خاوەن کتێب بوون، جوولەکەکان خۆیان بە خاوەن فەزڵ دەزانی بەسەریانەوە بەهۆی

زانستیانەوە، لەبەر ئەوە پشتیوانان شوێنی زۆربەی کردارەکانیان دەکەوتن، جوولەکەکان لەگەڵ خێزانەکانیان جووت نەدەبوون لەسەر لا نەبوایە، پشتیوانەکانیش ئەوەیان لە جوولەکەکانەوە وەرگرتبوو، بەڵام قورەیشییەکان بە هەموو شێوەیەك لەگەڵ ئافرەتدا جووتدەبوون لەپشتەوە و لەپێشەوە و بەڕاکشانەوە لەسەر پشت، کاتێك کۆچبەران هاتن بۆ مەدینە، کۆچەرییەك ئافرەتێکی لە پشتیوانان خواست، ویستی بەوشێوەیەی قورەیشییەکان جووت بێت لەگەڵی، ژنەکە ڕێگای پێنەدا و پێی ناخۆشبوو، گوتی لەسەر لا جووتبە لەگەڵم یان لێم دوورکەوە، هەتاکو باسەکەیان لە مەدینە بڵاوبوویەوە، ئەو باسە گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ﴾، واتە: جووتبن لەگەڵ خێزانەکانتان لەپێشەوە و لەپشتەوە و بەڕاکشانەوە ئەگەر جووتبوونەکە لە شوێنی منداڵبوونەوە بێت.

قورتبی دەڵێت: ئەمە دوو هۆکاری جیاوازە، دوور نییە ئایەتە بۆ وەڵامی هەردوو کۆمەڵەکە لە یەك کاتدا دابەزیبێت، یان ئایەتەکە لە دوو کاتی جیاوازدا دابەزیوە، وەك چۆن ڕیوایەتکراوە لە زیاتر لە کەسێکەوە لە ڕیوایەتکارەکانەوە سەبارەت بە سورەتی الفاتحە دەڵێن: لە مەککە و لە مەدینەش دابەزیوە[1].

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: لە بنەڕەتدا ئایەت یەکجار دادەبەزێت، بەوەش ئەو هۆکارەنەی پێش دابەزینی ئایەتەکە بوونی هەبووە، خوا ﷻ ئایەتێکی دابەزاندووە

(١). (المفهم لما أشكل من تلخيص كتاب مسلم)(١٥٧/٤).

حوكمی ئەو هۆكارانەی ڕوونكردووەتەوە، ئەگەر صەحیح بێت ئایەتێك دووجار دابەزێت ئەوە دەگمەنە، باسی ئەوەكراوە سورەتی فاتیحە دوو جار دابەزیوە جارێك لە مەككە و جارێك لە مەدینە، بەڵام قسەكە ئەوەیە ئەگەر باسی هۆكارەكان چەند هۆكارێك بێت و تەنها یەك ئایەت بۆ هەموویان دابەزبێت، ئەو كاتە دوو لێكدانەوەی بۆ دەكرێت: یان ئەوەیە هۆكارەكان چەند هۆكارێكن یەك ئایەتە بۆ ئەو هۆكارانە دابەزیوە، ئەمە كاتێك هەردوو دەربڕینەكە ڕاشكاوبێت كە لەوبارەیەوە دابەزیوە، بەڵام ئەگەر كەسێكیان بڵێت: (نزلت في كذا)، ئەویتریان بڵێت: (كان كذا فنزلت الآية)، زانراوە ئێمە دووەمیان پێش دەخەین چونكە ئاشكرایە، هەروەها ئەگەر كەسێكیان بڵێت: (سبب نزولها كذا)، ئەویتریان بڵێت: (نزلت في كذا)، ئەوەیان پێش دەخەین كە دەڵێت: (سبب نزول الآية) چونكە ڕاشكاوە.

جێگای ئاماژە پێدانە یەكەمیان كە ڕاشكاوە بێگومان ئەوە هۆكاری دابەزینە، دووەمیان، دەڵێین: ئەمە بۆ مانا باسكراوە، مەبەست ئەوەیە ئەم شتە مانای ئایەتەكە دەیگرێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر بگوترێت ئەو ئایەتەی خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ۝٥﴾(المَاعُون)، دەربارەی ئەو كەسانە دابەزیوە نوێژ لە كاتی خۆیدا دوا دەخەن، مانای ئەوە نییە دواخستنی نوێژی لە كاتی خۆی هۆكاری دابەزینی ئایەتەكەیە، بەڵكو ئەو مانایەی بەبیردا دێت ئایەتەكە ئەو باسە دەگرێتەوە، بەوپێیەش ئەم قسەیە تەفسیرە و باسی هۆكاری دابەزین نییە.

(وَهَذَانِ الصِّنْفَانِ اللَّذَانِ ذَكَرْنَاهُمَا فِي تَنَوُّعِ التَّفْسِيرِ: تَارَةً لِتَنَوُّعِ الْأَسْمَاءِ وَالصِّفَاتِ، وَتَارَةً لِذِكْرِ بَعْضِ أَنْوَاعِ الْمُسَمَّى وَأَقْسَامِهِ كَالتَّمْثِيلَاتِ؛ هُمَا الْغَالِبُ فِي تَفْسِيرِ سَلَفِ الْأُمَّةِ الَّذِي يُظَنُّ أَنَّهُ مُخْتَلِفٌ).

واتە: ئەم دوو جۆرەی باسمانکردن لە جۆراوجۆری تەفسیر: جارێك لەبەر جۆراوجۆری ناو و سیفەتەکانە، و جارێك بۆ باسکردنی ناولێنراو و بەشەکانییەتی وەك نموونە بۆی هێناوە؛ زۆرینەی تەفسیرەکان سەلەفی ئوممەت لەم دوو جۆرەن کە واگومان دەبرێت دژیەکن.

(وَمِنْ التَّنَازُعِ الْمَوْجُودِ عَنْهُمْ مَا يَكُونُ اللَّفْظُ فِيهِ مُحْتَمِلًا لِلْأَمْرَيْنِ؛ إمَّا لِكَوْنِهِ مُشْتَرَكًا فِي اللَّفْظِ كَلَفْظِ (قَسْوَرَةٍ) الَّذِي يُرَادُ بِهِ الرَّامِي وَيُرَادُ بِهِ الْأَسَدُ، وَلَفْظِ (عَسْعَسَ) الَّذِي يُرَادُ بِهِ إقْبَالُ اللَّيْلِ وَإِدْبَارُهُ).

واتە: لەو ناکۆکییانەی بوونی هەیە لەفزێك دوو مانا هەڵبگرێت، یان لەبەر ئەوەی هاوبەشییەك هەیە لە لەفزەکەدا، وەك لەفزی (قسوره) کە مەبەست لەو کەسەیە هاوێژەره(الرامی)، بە مانای شێریش بەکاردێت، و لەفزی (عسعس) کە بە مەبەستی هاتنی شەو و کۆتایی هاتنیشی بە کاردێت.

مەبەستی شێخی ئیسلام ئەو ناکۆکییەی کە کەمیشە لە تەفسیردا هەندێکی بەهۆی زمانەوەیە، چونکە وشەی واهەیە زیاتر لە مانایەك هەڵدەگرێت، بەڵکو جاری واهەیە وشە مانایەك و دژەکەیشی دەگەیەنێت وەك وشەی : ﴿قَسْوَرَةٍ﴾ کە بە نموونەیە هێناویەتییەوە، لەو ئایەتەی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ ٥١﴾(المُدَّثِّر).

واتە: هەڵدێن لە ترسی شێر یان ڕاوچی کاتێك دەیەوێت ڕاویان بکەن.

بوخاری لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ﴿قَسْوَرَةٍ﴾ چپە و دەنگی خەڵکە، ئەبوهورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: ﴿قَسْوَرَةٍ﴾ شێرە، و هەموو توند و تیژێك ﴿قَسْوَرَةٍ﴾یە، ﴿مُّسْتَنفِرَةٌ﴾ تۆقیوە و هەڵدێت؛ ئیبن کەسیر دەڵێت: ﴿كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ۝ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍ ۝﴾(المُدَّثِّر)، واتە: لە پشتهەڵکردن و هەڵهاتنیان لە حەق وەك کەری کێوین کە هەڵدێن لەو شێرەی دەیەوێت ڕاویان بکات، ئەوە بۆچوونی ئەبوهورەیرە و ئیبن عەباسە لە ڕیوایەتێکدا، و زەیدی کوڕی ئەسلەم و عەبدالرحمانی کوڕی زەید، و لە ڕیوایەتێکی تردا ئیبن عەباس دەڵێن: هەڵدێن وەك لە دەستی ڕاوچی هەڵدێن، ئەمە بۆچوونی جمهورە، حەمادی کوڕی سەلەمە لە عەلی کوڕی زەید و یوسفی کوڕی مەهران لە ئیبن عەباسەوە دەڵێت: شێر بە عەرەبی پێی دەڵێن: (الأسد)، بە حەبەشی پێی دەڵێن: ﴿قَسْوَرَةٍ﴾، بە فارسی پێی دەڵێن: (شیر)، بە نەبەتی پێی دەڵێن: (أویا).

و وشەی ﴿عَسْعَسَ﴾، ئیبن کەسیر دەڵێت: ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ۝﴾(التَّكْوِير)، دوو لێکدانەوەی بۆ کراوە، یەکەمیان: هاتنی تاریکی شەوە، موجاهید دەڵێت: تاریکی داهێنا، سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: ئەگەر شەو دەستی پێکرد، حەسەنی بەسری و عەتییەی عەفوی دەڵێن: کاتێك شەو خەڵکی داپۆشی، عەلی کوڕی ئەبوتەڵحە و عەوفی لە ئیبن عەباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێت: ﴿إِذَا عَسْعَسَ﴾ واتە: ئەگەر پشت هەڵبکات،

ئەوە بۆچوونی موجاهید و قەتادە و زەحاکە، هەروەها زەیدی کوڕی ئەسلەم و کوڕەکەی هەمان بۆچوونیان هەیە و دەڵێن: ﴿إِذَا عَسْعَسَ﴾ ئەگەر ڕۆیشت و پشتی هەڵکرد.

(وَإِمَّا لِكَوْنِهِ مُتَوَاطِئًا فِي الْأَصْلِ لَكِنَّ الْمُرَادَ بِهِ أَحَدُ النَّوْعَيْنِ أَوْ أَحَدُ الشَّيْئَيْنِ كَالضَّمَائِرِ فِي قَوْلِهِ: ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ⑧ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ⑨﴾(النَّجْم)، وَكَلَفْظِ: ﴿وَالْفَجْرِ ① وَلَيَالٍ عَشْرٍ ② وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ ③﴾(الفَجْر) وَمَا أَشْبَهَ ذَلِكَ؛ فَمِثْلُ هَذَا قَدْ يَجُوزُ أَنْ يُرَادَ بِهِ كُلُّ الْمَعَانِي الَّتِي قَالَهَا السَّلَفُ، وَقَدْ لَا يَجُوزُ ذَلِكَ؛ فَالْأَوَّلُ إِمَّا لِكَوْنِ الْآيَةِ نَزَلَتْ مَرَّتَيْنِ فَأُرِيدَ بِهَا هَذَا تَارَةً وَهَذَا تَارَةً).

واتە: یان لەبەر ئەوەیە ئەو لەفزە یەك مانای هەیە بەڵام چەند شتێك دەگرێتەوە، بەڵام مەبەست یەك جۆریانە، یان یەك شتیانە، وەك ئەو ڕاناوانەی لەم ئایەتەدایە: پاشان لە پێغەمبەری خوا نزیکبوویەوە، و لە بەرزییەوە دابەزی بۆ لای؛ بە ئەندازەی دوو کەوان، بەڵکو کەمتر لە پێغەمبەری خواوە نزیکبوو.

و ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: سوێند بە بەرەبەیان، و سوێند بە دە شەوەکە، و سوێند بە جووت و تاك؛ هاوشێوەی ئەوانە دەگونجێت و دروستە هەموو ئەو مانایانە مەبەست بێت کە سەلەف دەربارەی گوتویانە، و لەوانەیە نەگونجێت و دروست نەبێت، یەکەم یان لەبەر ئەوەی ئایەتەکە دووجار دابەزیوە جارێك مانای یەکەم مەبەستە، و جارێك مانای دووەم.

لە ئایەتەکانی سورەتی النجمدا کە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ⑧ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ⑨﴾ ئایا ڕانەوەکانی بۆ خوای پەروەردگار دەگەڕێتەوە یان بۆ جبریل

عليه السلام، ئەوەی بۆچوونی دروستە بۆ جبریل دەگەڕێتەوە، چونکە ئایەتەکانی پێش ئەم ئایەتانە باسی جبریل دەکات، ئەحمەد و ترمزی لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ﴿مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ⑪﴾ پێغەمبەری خوا ﷺ جبریلی بینی شتێکی وەك پۆشاکی ئاوریشمی ئەستور و تەنکی لەبەردابوو، نێوان ئاسمان و زەوی داپۆشیبوو؛ مسلم لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ﴿مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ⑪﴾ پێغەمبەری خوا ﷺ جبریلی بینی شەش سەد باڵی هەبوو؛ ئیبن حبان دەڵێت: ئەبوحاتەم دەڵێت: خوا لە شەوی ئیسرائدا فەرمانیکرد بە جبریل کە پێغەمبەری خوا محمد ﷺ فێر بکات وەك دەفەرموێت: ﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ⑤ ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ⑥ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ⑦﴾ مەبەست جبریلە، ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ⑧﴾ مەبەست جبریلە، ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ⑨﴾ مەبەست جبریلە، ﴿فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ⑩﴾ بە جبریلدا، ﴿مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ⑪﴾ مەبەستی ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردگاری بە دڵی بینیوە لەو شوێنە پیرۆزە[1]؛ ئەحمەد و تەبەرانی لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دووجار نەبێت جبریلی لەسەر شێوەی خۆی نەبینیوە، جارێك داوای لێکرد لەسەر شێوەی خۆی بیبینێت، خۆی پیشاندا ئاسۆی داپۆشی، جارەکەی تر لەگەڵیدا سەرکەوت بۆ ئاسمان لەو ئایەتانەدا کە

(١). (صحيح ابن حبان)(٢٥٧/١).

دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ۝٧ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ۝٨ فَكَانَ قَابَ قَوۡسَيۡنِ أَوۡ أَدۡنَىٰ ۝٩
فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ ۝١٠﴾، کاتێك جبریل هەستی بە مەزنی پەروەردگاری کرد
گەڕایەوە سەرشێوەی خۆی و سوژدەی برد، دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ ۝١٣
عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ ۝١٤ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ ۝١٥ إِذۡ يَغۡشَى ٱلسِّدۡرَةَ مَا يَغۡشَىٰ ۝١٦ مَا
زَاغَ ٱلۡبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ۝١٧ لَقَدۡ رَأَىٰ مِنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ ۝١٨﴾(النَّجم).

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡفَجۡرِ ۝١﴾ سوێند بە بەرەبەیان.

زانایان چەند لێکدانەوەیەکیان بۆ ئەم ئایەتە کردووە، بە مانای بەرەبەیان و کۆتایی شەو، بە مانای نوێژی بەیانی لێکدراوەتەوە، ئیبن کەسیر دەڵێت: ﴿ٱلۡفَجۡرِ﴾ زانراوە و بریتییە لە بەرەبەیان، ئەوە بۆچوونی عەلی و ئیبن عەباس و موجاهید و عیکرمە و سودییە، مەسروق و موجاهید و محمدی کوڕی کەعب دەڵێن: مەبەست بەرەبەیانی ڕۆژی جەژنی قوربانە بەتایبەت، کە کۆتایی دە شەوەکەی سەرەتای مانگی حاجییانە؛ گوتراوە: مەبەست ئەو نوێژەیە کە لەو کاتەدا ئەنجام دەدرێت، ئەوە بۆچوونی عیکرمەیە، گوتراوە: مەبەست هەموو ڕۆژە، ئەوە ڕیوایەتێکە لە ئیبن عەباسەوە.

﴿وَلَيَالٍ عَشۡرٖ ۝٢﴾ و سوێند بە دە شەوەکە.

تەبەری لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: بێگومان ئەو دە شەوەی خوا سوێندی پێ خواردووە بریتییە لە: دە شەوەکەی سەرەتای مانگی حاجییان؛ بوخاری لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ

دەفەرموێت: لە هیچ ڕۆژێكدا ئەنجامدانی كردەوە پاداشتی باشتر نییە لە ئەنجامدانی لەم ڕۆژانە، گوتیان: جیهاد و تێكۆشانیش، فەرمووی: جیهاد و تێكۆشانیش، ئیللا كەسێك بە ماڵ و نەفسی دەربچێت و تیابچێت و نەگەڕێتەوە؛ ئیبن كەسیر دەڵێت: مەبەست لەو دە شەوە سەرەتای مانگی حاجییانە، ئەوە بۆچوونی ئیبن عەباس و ئیبن زوبێر و موجاهید و زیاتر لە زانایەكی سەلەف و خەلەفە؛ بەڵام ئیبن عوسەیمین بۆچوونی وایە: ﴿وَلَيَالٍ عَشْرٍ ۝٢﴾ مەبەست دە شەوەكەی كۆتایی مانگی ڕەمەزانە.

﴿وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ۝٣﴾ و سوێند بە جووت و تاك.

تەبەری لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی كردووە و ئیبن حەجەر بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ﴿ٱلْوَتْرِ﴾ ڕۆژی عەرەفەیە، ﴿ٱلشَّفْعِ﴾ ڕۆژی جەژنی قوربانە؛ بوخاری لە موجاهیدەوە ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: ﴿وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ۝٣﴾ هەموو شتێك خوا دروستی كردووە ﴿ٱلشَّفْعِ﴾ ئاسمانە، ﴿ٱلْوَتْرِ﴾ خوایە؛ ئیبن حەجەر لە (فتح الباری)(٦/٣٦٥)دا دەڵێت: مەبەستی موجاهید ئەوەیە هەموو شتێك هاوتایەكی هەیە بەرامبەریەتی و لەگەڵیدا باس دەكرێت، وەك جووتی وایە، بۆ نموونە: زەوی و ئاسمان، مرۆڤ و جن؛ خوا ویترە بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی كە ئەحمەد و خاوەن سونەنەكان لە عەلییەوە ڕیوایەتیان كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: خوا ویترە و ویتری خۆش دەوێت؛ هەموو دروستكراوەكان

جووتن، خوا دەفەرموێت: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾﴾(الذَّارِيَات)، ئەوە هەڵبژاردەی شەنقیتییە.

(وَإِمَّا لِكَوْنِ اللَّفْظِ الْمُشْتَرَكِ يَجُوزُ أَنْ يُرَادَ بِهِ مَعْنَيَاهُ إِذْ قَدْ جَوَّزَ ذَلِكَ أَكْثَرُ الْفُقَهَاءِ: الْمَالِكِيَّةُ وَالشَّافِعِيَّةُ وَالْحَنْبَلِيَّةُ وَكَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكَلَامِ).

واتە: یان لەبەر ئەوەیە لەفزەکە هاوبەشە و چەند مانایەك دەگەیەنێت، دەشێت مەبەست هەردوو ماناکەی بێت، زۆربەی شەرعزانەکانی مالکییەکان و شافعییەکان و حەنبەلییەکان و زۆربەی ئەهلی کەلام ئەوەیان بە دروست زانیوە.

(وَإِمَّا لِكَوْنِ اللَّفْظِ مُتَوَاطِئًا فَيَكُونُ عَامًّا إِذَا لَمْ يَكُنْ لِتَخْصِيصِهِ مُوجِبٌ فَهَذَا النَّوْعُ إِذَا صَحَّ فِيهِ الْقَوْلَانِ كَانَ مِنْ الصِّنْفِ الثَّانِي).

یان لەبەر ئەوەیە لەفزەکە یەك مانای هەیە بەڵام چەند شتێك دەگرێتەوە، ئەو کاتە گشتگیرە ئەگەر شتێك تایبەتمەندکردنی پێویست نەکات، ئەم جۆرە ئەگەر دوو بۆچوونی صەحیح هەبوو لەبارەیەوە لە جۆری دووەمە.

(وَمِنْ الْأَقْوَالِ الْمَوْجُودَةِ عَنْهُمْ وَيَجْعَلُهَا بَعْضُ النَّاسِ اخْتِلَافًا أَنْ يُعَبِّرُوا عَنْ الْمَعَانِي بِأَلْفَاظٍ مُتَقَارِبَةٍ لَا مُتَرَادِفَةٍ فَإِنَّ التَّرَادُفَ فِي اللُّغَةِ قَلِيلٌ، وَأَمَّا فِي أَلْفَاظِ الْقُرْآنِ فَإِمَّا نَادِرٌ وَإِمَّا مَعْدُومٌ.

وَقَلَّ أَنْ يُعَبَّرَ عَنْ لَفْظٍ وَاحِدٍ بِلَفْظٍ وَاحِدٍ يُؤَدِّي جَمِيعَ مَعْنَاهُ؛ بَلْ يَكُونُ فِيهِ تَقْرِيبٌ لِمَعْنَاهُ وَهَذَا مِنْ أَسْبَابِ إعْجَازِ الْقُرْآنِ).

**واته: و لەو بۆچوونانەی لای سەلەف هەبووە و هەندێك خەڵك بە ناكۆكی دادەنێن، بریتییە لەوەی گوزارشت لە ماناكان بكەن بە چەند لەفزێك ماناكانی نزیك بێت لە یەكەوە، نەوەك هاومانابن (مترادف)، چونكە هاومانا لە زماندا كەمە، و لە لەفزەكانی قورئاندا یان دەگمەنە یان بوونی نییە.**

**و كەمە گوزارشت لە لەفزێك بكرێت بە لەفزێكی تر هەموو ماناكانی ببەخشێت؛ بەڵكو نزیككردنەوەی مانای تێدایە ئەمەش لە هۆكاری ئیعجازی قورئانە.**

(فَإِذَا قَالَ الْقَائِلُ: ﴿يَوْمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوْرًا ۝٩﴾(الطُّور)، إنَّ الْمَوْرَ هُوَ الْحَرَكَةُ كَانَ تَقْرِيبًا إذْ الْمَوْرُ حَرَكَةٌ خَفِيفَةٌ سَرِيعَةٌ.

وَكَذَلِكَ إذَا قَالَ: (الْوَحْيُ) الْإِعْلَامُ، أَوْ قِيلَ: ﴿أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ۝١٦٣﴾(النِّسَاءِ) أَنْزَلْنَا إلَيْك، أَوْ قِيلَ: ﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾(الإِسْرَاء) أَيْ: أَعْلَمْنَا وَأَمْثَالُ ذَلِكَ؛ فَهَذَا كُلُّهُ تَقْرِيبٌ لَا تَحْقِيقٌ، فَإِنَّ الْوَحْيَ هُوَ إعْلَامٌ سَرِيعٌ خَفِيٌّ، وَالْقَضَاءُ إلَيْهِمْ أَخَصُّ مِنْ الْإِعْلَامِ فَإِنَّ فِيهِ إنْزَالًا إلَيْهِمْ وَإِيحَاءً إلَيْهِمْ).

**واته: ئەگەر كەسێك بڵێت (المور) لەو ئایەتەی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوْرًا ۝٩﴾، بریتییە لە جووڵە ئەوە مانایەكی نزیكە چونكە (المور) جووڵەیەكی كەمی خێرایە، هەروەها ئەگەر بڵێت: (الوحی) پێڕاگەیاندنە، یان بگوترێت:**

﴿أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ ١٦٣﴾(النِّسَاءِ) بۆمان دابەزاندوویت، یان بگوترێت: ﴿وَقَضَيۡنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾(الإِسْرَاء) واتە: فێرمانکردن و هاوشێوەی ئەوانە، هەموو ئەوانە نزیککردنەوەیە و پێکانی ماناکە نییە، چونکە وەحی پێڕاگەیاندێکی خێرای شاراوەیە، و (القضاء) تایبەتترە لە (الإعلام) چونکە دابەزاندن و ئاماژەی تێدایە بۆیان.

(وَالْعَرَبُ تُضَمِّنُ الْفِعْلَ مَعْنَى الْفِعْلِ وَتُعَدِّيهِ تَعْدِيَتَهُ وَمِنْ هُنَا غَلِطَ مَنْ جَعَلَ بَعْضَ الْحُرُوفِ تَقُومُ مَقَامَ بَعْضٍ كَمَا يَقُولُونَ فِي قَوْلِهِ: ﴿قَالَ لَقَدۡ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعۡجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ﴾(ص)، أَيْ: مَعَ نِعَاجِهِ، و﴿مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ١٤﴾(الصَّفّ) أَيْ: مَعَ اللَّهِ وَنَحْوَ ذَلِكَ).

واتە: عەرەب مانای کردار و تێپەڕاندنی پێکەوە بە کاردەهێنێت، لێرەوە هەندێك هەڵەیان کردووە هەندێك پیتیان لە جێگای هەندێك شت داناوە، وەك دەربارەی ئەو ئایەتە دەڵێن: ﴿قَالَ لَقَدۡ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعۡجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ﴾(ص)، واتە: لەگەڵ مەڕەکانی، و ﴿مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ١٤﴾(الصَّفّ)، واتە: لەگەڵ خوا، هاوشێوەی ئەوانە.

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: وشەی ﴿بِسُؤَالِ﴾ مانای (الضم) تێدایە، واتە: بۆ ئەوەی مەڕەکەی تۆ ببات بۆ خۆی، واتە: مانای (إلى) لێکدانەوەی (مع) نییە، هەروەها ﴿مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ١٤﴾ مانای ئەوە نییە کێ پشتیوانە لەگەڵم بۆ لای خوا، بەڵام بەوشێوەیە نییە، بەڵکو مانای ئەوەیە کێ لەگەڵمدا دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا[1].

(١). (شرح مقدمة أصول التفسير)(٦٠).

(وَالتَّحْقِيقُ مَا قَالَهُ نُحَاةُ الْبَصْرَةِ مِنْ التَّضْمِينِ فَسُؤَالُ النَّعْجَةِ يَتَضَمَّنُ جَمْعَهَا وَضَمَّهَا إلَي نِعَاجِهِ، وَكَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَفۡتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ ٧٣﴾(الإِسْرَاء) ضُمِّنَ مَعْنَى يُزِيغُونَك وَيَصُدُّونَك.

وَكَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿وَنَصَرۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ ٧٧﴾(الأَنبيَاء) ضُمِّنَ مَعْنَى نَجَّيْنَاهُ وَخَلَّصْنَاهُ، وَكَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ ٦﴾(الإِنسَان) ضُمِّنَ يُرْوَى بِهَا وَنَظَائِرُهُ كَثِيرَةٌ).

واتە: ئەوەی ئەرجەحە بۆچوونی نەحوییەکانی بەصرەیە کە دەڵێن: کردارەکە مانای تێپەڕیش لەخۆ دەگرێت، پرسیاری مەڕەکە مانای کۆکردنەوە لەگەڵ مەڕەکانیدا لەخۆ دەگرێت، هەروەها ئەوەی دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَفۡتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ ٧٣﴾(الإِسْرَاء) مانای لادان و ڕێگریکردن لە خۆ دەگرێت.

هەروەها ئەوەی دەفەرموێت: ﴿وَنَصَرۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ ٧٧﴾(الأَنبيَاء)، مانای ڕزگارمان کرد و هەڵمانبژارد لەخۆ دەگرێت، هەروەها ئەوەی دەفەرموێت: ﴿عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ ٦﴾(الإِنسَان) مانای تینوێتی شکانی تێدایە، و هاوشێوەی ئەوە زۆرە.

(وَمَنْ قَالَ: "لَا رَيْبَ، لَا شَكَّ" فَهَذَا تَقْرِيبٌ، وَإِلَّا فَالرَّيْبُ فِيهِ اضْطِرَابٌ وَحَرَكَةٌ، كَمَا قَالَ: ((دَعْ مَا يَرِيبُك إلَي مَا لَا يَرِيبُك))[1]، وَفِي الْحَدِيثِ أَنَّهُ: ((مَرَّ بِظَبْيٍ حَاقِفٍ فَقَالَ: لَا يَرِيبُهُ أَحَدٌ))[2]، فَكَمَا أَنَّ الْيَقِينَ ضُمِّنَ السُّكُونَ وَالطُّمَأْنِينَةَ، فَالرَّيْبُ ضِدُّهُ ضُمِّنَ الِاضْطِرَابَ وَالْحَرَكَةَ، وَلَفْظُ "الشَّكِّ" وَإِنْ قِيلَ: إنَّهُ يَسْتَلْزِمُ هَذَا الْمَعْنَى؛ لَكِنَّ لَفْظَهُ لَا يَدُلُّ عَلَيْهِ).

واتە: هەركەسێك بڵێت: (لا ريب) ماناى (لا شك)ەیە، ئەمە نزیككردنەوەی مانایە، ئەگەرنا (الريب) شڵەژان و جووڵەی تێدایە، وەك دەفەرموێت: دەست هەڵبگرە لەوەی گومانت لێی هەیە و دەتشڵەژێنێت، و ئەو كردەوەیە ئەنجام بدە كە گومانت لێی نییە؛ و لە فەرموودەیەكدا هاتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای ئاسكێكدا تێپەڕی لە سێبەرێكدا خەوتبوو، فەرمووی: كەس نەیشڵەژێنێت و نەیترسێنێت، وەك چۆن دڵنیایی (اليقين) مانای نەجووڵان و ئارامی تێدایە، (الريب) دژییەتی و مانای شڵەژان و جووڵەی تێدایە، و لەفزی (الشك) ئەگەرچی گوتراوە: ئەو مانایە دەگەیەنێت، بەڵام لەفزەكەی بەڵگەی ئەوە تێدا نییە.

(وَكَذَلِكَ إذَا قِيلَ: ﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ ۝٢﴾(البَقَرَة) هَذَا الْقُرْآنُ فَهَذَا تَقْرِيبٌ؛ لِأَنَّ الْمُشَارَ إلَيْهِ وَإِنْ كَانَ وَاحِدًا فَالْإِشَارَةُ بِجِهَةِ الْحُضُورِ غَيْرُ الْإِشَارَةِ بِجِهَةِ الْبُعْدِ وَالْغَيْبَةِ، وَلَفْظُ "الْكِتَابِ" يَتَضَمَّنُ مِنْ كَوْنِهِ مَكْتُوبًا مَضْمُومًا مَا لَا يَتَضَمَّنُهُ لَفْظُ

---

(١). أخرجه أحمد(١٧٢٣) والترمذي(٢٥١٨) والنسائي(٥٧١١) وصححه الألباني.
(٢). أخرجه النسائي(٢٨١٧)، وصححه الألباني.

الْقُرْآنِ مِنْ كَوْنِهِ مَقْرُوءًا مُظْهَرًا بَادِيًا فَهَذِهِ الْفُرُوقُ مَوْجُودَةٌ فِي الْقُرْآنِ، فَإِذَا قَالَ أَحَدُهُمْ: ﴿أَن تُبْسَلَ ۝٧٠﴾(الأنعام)، أَيْ تَحْبِسَ وَقَالَ الْآخَرُ: تُرْتَهَنَ وَنَحْوَ ذَلِكَ، لَمْ يَكُنْ مِنْ اخْتِلَافِ التَّضَادِّ وَإِنْ كَانَ الْمَحْبُوسُ قَدْ يَكُونُ مُرْتَهَنًا وَقَدْ لَا يَكُونُ إِذْ هَذَا تَقْرِيبٌ لِلْمَعْنَى كَمَا تَقَدَّمَ).

واتە هەروەها ئەگەر بگوترێت: مانای ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ ۝٢﴾ ئەم قورئانەیە، ئەوە نزیککردنەوەی مانایە؛ چونکە ئەوەی ئاماژەی بۆ کراوە ئەگەرچی یەك شتە، ئاماژەکردن بۆ ئاراستەی نزیك و حزور جیاوازە بۆ ئاراستەی دوور و نادیار، لەفزی کتێب لەگەڵ ئەوەی نوسراوێك لەخۆی دەگرێت لەفزی قورئان ئەو مانایە لەخۆ ناگرێت، کە مانای خوێندراوەی دەرخەری مانا دیارە، ئەم جیاوازییانە بوونی هەیە لە قورئاندا، ئەگەر کەسێکیان بلێت: ﴿أَن تُبۡسَلَ ۝٧٠﴾ واتە: بەندی بکەیت، و کەسێکی تر بلێت: بە بارمتەی بگیرێت و هاوشێوەی ئەوانە، لە ناکۆکی دژیەك نییە ئەگەرچی ئەوەی بەندکراوە لەوانەیە بە بارمتەگیرابێت، و لەوانەیە بارمتەش نەبێت، کەواتە ئەمە نزیککردنەوەیە بۆ تێگەیشتن وەك پێشتر باسکرا.

(وَجَمْعُ عِبَارَاتِ السَّلَفِ فِي مِثْلِ هَذَا نَافِعٌ جِدًّا؛ فَإِنَّ مَجْمُوعَ عِبَارَاتِهِمْ أَدَلُّ عَلَى الْمَقْصُودِ مِنْ عِبَارَةٍ أَوْ عِبَارَتَيْنِ وَمَعَ هَذَا فَلَابُدَّ مِنْ اخْتِلَافٍ مُحَقَّقٍ بَيْنَهُمْ كَمَا يُوجَدُ مِثْلُ ذَلِكَ فِي الْأَحْكَامِ).

واتە: کۆ کردنەوەی گوزارشت و دەربڕینەکانی سەلەف لە هاوشێوەی ئەم پرسانە زۆر بە سودە؛ چونکە کۆی دەربڕین و گوزارشتەکانیان زیاتر مانا و مەبەست دەگەیەنێت

وەك لە گوزارشتێك یان دوو گوزارشت، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ناکۆکی هەبێت لە نێوانیاندا وەك چۆن ئەو ناکۆکییە لە نێوانیاندا لە حوکمەکاندا هەیە.

(وَنَحْنُ نَعْلَمُ أَنَّ عَامَّةَ مَا يُضْطَرُّ إِلَيْهِ عُمُومُ النَّاسِ مِنْ الِاخْتِلَافِ مَعْلُومٌ، بَلْ مُتَوَاتِرٌ عِنْدَ الْعَامَّةِ أَوْ الْخَاصَّةِ كَمَا فِي عَدَدِ الصَّلَوَاتِ وَمَقَادِيرِ رُكُوعِهَا وَمَوَاقِيتِهَا وَفَرَائِضِ الزَّكَاةِ وَنُصُبِهَا وَتَعْيِينِ شَهْرِ رَمَضَانَ وَالطَّوَافِ وَالْوُقُوفِ وَرَمْيِ الْجِمَارِ وَالْمَوَاقِيتِ وَغَيْرِ ذَلِكَ).

واتە: ئێمە دەزانین زۆربەی ئەوەی زۆربەی خەڵك پێویستیان پێی دەبێت لە ناکۆکی حوکمەکان زانراوە بەڵکو متەواترە لای عامەی خەڵك یان ئەوانەی تایبەتن بە زانستی شەرعییەوە وەك ژمارەی نوێژەکان و ئەندازەی ڕکوعەکانی و کاتەکانی، و فەرزەکانی زەکات و ئەو ئەندازەیەی زەکاتی تێدا پێویست دەبێت، و دیاریکردنی مانگی ڕەمەزان، و تەواف، و وەستان لە عەرەفات، و بەردگرتنە جەمرەکان، و کاتەکانی حەج، جگە لەوانەش.

(ثُمَّ اخْتِلَافُ الصَّحَابَةِ فِي الْجَدِّ وَالْإِخْوَةِ وَفِي الْمُشَرَّكَةِ وَنَحْوِ ذَلِكَ لَا يُوجِبُ رَيْبًا فِي جُمْهُورِ مَسَائِلِ الْفَرَائِضِ، بَلْ مَا يَحْتَاجُ إِلَيْهِ عَامَّةُ النَّاسِ هُوَ عَمُودُ النَّسَبِ مِنْ الْآبَاءِ وَالْأَبْنَاءِ وَالْكَلَالَةِ مِنْ الْإِخْوَةِ وَالْأَخَوَاتِ وَمِنْ نِسَائِهِمْ كَالْأَزْوَاجِ فَإِنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ فِي الْفَرَائِضِ ثَلَاثَ آيَاتٍ مُفَصَّلَةٍ ذَكَرَ فِي الْأُولَى الْأُصُولَ وَالْفُرُوعَ وَذَكَرَ فِي الثَّانِيَةِ الْحَاشِيَةَ الَّتِي تَرِثُ بِالْفَرْضِ كَالزَّوْجَيْنِ وَوَلَدِ الْأُمِّ وَفِي الثَّالِثَةِ الْحَاشِيَةَ الْوَارِثَةَ بِالتَّعْصِيبِ وَهُمْ الْإِخْوَةُ لِأَبَوَيْنِ أَوْ لِأَبٍ وَاجْتِمَاعُ الْجَدِّ وَالْإِخْوَةِ نَادِرٌ؛ وَلِهَذَا لَمْ يَقَعْ فِي الْإِسْلَامِ إِلَّا بَعْدَ مَوْتِ النَّبِيِّ ﷺ).

واتە: پاشان ناكۆكی هاوەڵان دەربارەی باپیر و برا و هاوبەشیان و هاوشێوەی ئەوانە، گومان دروست ناكات لە زۆربەی پرسەكانی میرات، بەڵكو ئەوەی عامەی خەڵك پێویستییان پێیەتی بریتییە لە زنجیرەی ڕەچەڵەك لە باوكان و كوڕەكان و ئەو كەسانەی دەمرن نەكوڕیان هەیە و نەباوكیان هەیە لە براكان و خوشكەكان و ژنەكانیان وەك هاوسەرەكان؛ چونكە بێگومان خوا دەربارەی میرات سێ ئایەتی دابەزاندووە و بە درێژی باسی كردووە، لە ئایەتی یەكەمدا باسی بنەڕەتەكان و فەرعەكان دەكات، لە ئایەتی دووەمدا باسی پەراوێزەكان (الحاشية) دەكات كە میرات دەبەن بەشێوەیەكی دیاریكراو (الفرض) وەك ژن و مێرد و كوڕی دایك، لە ئایەتی سێیەمدا باسی پەراوێز (الحاشية) دەكات كە میرات وەردەگرن بە (التعصيب) كە بریتین لە برا لە دایك و باوكەوە یان تەنها لە باوكەوە و كۆبوونەوەی باپیر و برا دەگمەنە؛ لەبەر ئەوە لە ئیسلامدا ڕووینەداوە دوای مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبێت.

شێخی ئیسلام باسی ئەوە دەكات زۆربەی ئەو حوكمانەی خەڵك پێویستیان پێیەتی ڕوون و ئاشكرایە و ناكۆكی تێدا نییە ئەگەر جۆرێك لە ناكۆكیش هەبێت لە جۆری ناكۆكی جۆرییە، ناكۆكی دژیەكی دەگمەنە، دەبێت ئەوەش بزانرێت شەرع ناكۆكی تێدا نییە بەڵكو ئەوە هەندێك لە زاناكانن هەندێك ئیجتهاد دەكەن هەڵە دەكەن و بۆچوونی هەڵە دەردەبڕن و ناكۆكی دروست دەبێت لەبەر ئەو هۆكارانەی كە شێخی ئیسلام لێرە ئاماژەی بۆ هەندێكی كردووە.

(وَالِاخْتِلَافُ قَدْ يَكُونُ لِخَفَاءِ الدَّلِيلِ أَوْ لِذُهُولٍ عَنْهُ وَقَدْ يَكُونُ لِعَدَمِ سَمَاعِهِ وَقَدْ يَكُونُ لِلْغَلَطِ فِي فَهْمِ النَّصِّ وَقَدْ يَكُونُ لِاعْتِقَادِ مُعَارِضٍ رَاجِحٍ فَالْمَقْصُودُ هُنَا التَّعْرِيفُ بِجُمَلِ الْأَمْرِ دُونَ تَفَاصِيلِهِ).

واتە: ناكۆكی لەوانەیە لەبەر شاراوەی بەڵگە بێت، یان لەبەر بێئاگای لە بەڵگە، یان لەبەر نەبیستنی، و لەوانەیە لەبەر هەڵە تێگەیشتن بێت لە تێگەیشتنی دەقەکە، و لەوانەیە لەبەر بیروباوەڕێکی پێچەوانەی ڕاجح بێت، ئەوەی مەبەستە لێرە بەکورتی باسکردن و ناساندنی پرسەکانە نەوەك درێژی.

شێخی ئیسلام نوسراوێکی هەیە بە ناوی (رفع الملام عن الأئمة الأعلام) بە درێژی باسی ناکۆکی زانایانی کردووە، لێرەش بە کورتی ئاماژەی بە هۆکاری ئەو ناکۆکییەیان کردووە:

یەکەم: شاراوەی و لەبیرچوون.

دووەم: نەبیستن و نەگەیشتنی بەڵگە.

سێیەم: تێنەگەیشتن یان هەڵە تێگەیشتن لە دەق.

چوارەم: بیروباوەڕێك پاڵنەری بێت ئەوەی پێچەوانەی ئەو پرسەیە بە ڕاجح بزانێت.

(فَصْلٌ:

الِاخْتِلَافُ فِي التَّفْسِيرِ عَلَي نَوْعَيْنِ مِنْهُ مَا مُسْتَنَدُهُ النَّقْلُ فَقَطْ وَمِنْهُ مَا يُعْلَمُ بِغَيْرِ ذَلِكَ؛ إِذْ الْعِلْمُ: إمَّا نَقْلٌ مُصَدَّقٌ، وَإِمَّا اسْتِدْلَالٌ مُحَقَّقٌ، وَالْمَنْقُولُ: إمَّا عَنْ الْمَعْصُومِ، وَإِمَّا عَنْ غَيْرِ الْمَعْصُومِ .

وَالْمَقْصُودُ بِأَنَّ جِنْسَ الْمَنْقُولِ - سَوَاءٌ كَانَ عَنْ الْمَعْصُومِ أَوْ غَيْرِ الْمَعْصُومِ وَهَذَا هُوَ النَّوْعُ الْأَوَّلُ - مِنْهُ مَا يُمْكِنُ مَعْرِفَةُ الصَّحِيحِ مِنْهُ وَالضَّعِيفِ وَمِنْهُ مَا لَا يُمْكِنُ مَعْرِفَةُ ذَلِكَ فِيهِ).

واتە: فەسڵێك:

ناكۆكی لە تەفسیردا دوو جۆرە، جۆرێكیان پاڵپشتە بە بەڵگەی نەقڵی بەتەنها، و جۆرێكی بەبێ ئەوە دەزانرێت؛ چونكە زانست: یان نەقڵێكی پشتڕاستكراوەیە، یان كردنە بەڵگەیەكی سەلمێنراو، ئەوەی نەقڵكراوە یان لە پێغەمبەری خواوەیە ﷺ، یان لە جگە لەوەوەیە.

مەبەست ئەوەیە ڕەگەزی نەقڵكراو "بێ جیاوازی ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەقڵكرابێت یان لە جگە لەوەوە ئەمە جۆری یەكەمە"، هەیانە دەتوانرێت صەحیح و زەعیفی بزانرێت، و هەیانە ناتوانرێت ئەوە بزانرێت.

شێخی ئیسلام باسی ئەو ناكۆكییانە دەكات لە تەفسیركردنی ئایەتەكانی قورئاندا دروست دەبێت، دەڵێت: جۆرێك لەو ناكۆكییانە پاڵپشتە بەو ئەسەرانەی نەقڵ دەكرێت، لە سەردەمی سەلەف و لای خەلەفیش گرنگی بە تەفسیركردنی قورئان بە ئەسەر دراوە،

بۆ نموونە: (جامع البيان عن تأويل آي القرآن) کە بە تەفسیری تەبەری ناسراوە و ئیمامی تەبەری نوسیویەتی، و (تفسير القرآن العظيم) کە بە تەفسیری ئیبن ئەبوحاتەم ناسراوە ئیمامی ئیبن ئەبوحاتەم نوسیویەتی، و ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا تەفسیری هەندێك وشە و ئایەتی هێناوە، هەروەها سیوتی (الدر المنثور في التفسير بالمأثور) نوسیوە.

جۆرێکی تر لە ناکۆکی ئەو ناکۆکییانەیە بەهۆی ئیجتهادی زانایانەوە دروست دەبێت، بوخاری و مسلم لە عەمری کوڕی عاصەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إذا حَكَمَ الحاكِمُ فاجْتَهَدَ ثُمَّ أصابَ فَلَهُ أجْرانِ، وإذا حَكَمَ فاجْتَهَدَ ثُمَّ أخْطَأَ فَلَهُ أجْرٌ)).

واتە: ئەگەر حاکمێك ئیجتهاد بکات حەق بپێکێت دوو پاداشتی بۆ هەیە، و ئەگەر ئیجتهاد بکات و نەیپێکێت و هەڵە بکات یەك پاداشتی بۆ هەیە.

(وَهَذَا الْقِسْمُ الثَّانِي مِنْ الْمَنْقُولِ، وَهُوَ مَا لَا طَرِيقَ لَنَا إلَي الْجَزْمِ بِالصِّدْقِ مِنْهُ؛ عَامَّتُهُ مِمَّا لَا فَائِدَةَ فِيهِ فَالْكَلَامُ فِيهِ مِنْ فُضُولِ الْكَلَامِ؛ وَأَمَّا مَا يَحْتَاجُ الْمُسْلِمُونَ إلَي مَعْرِفَتِهِ فَإِنَّ اللَّهَ نَصَبَ عَلَى الْحَقِّ فِيهِ دَلِيلًا).

واتە: ئەم جۆری دووەمە لە بەڵگەی نەقڵکراو، کە ناتوانین دڵنیابین لە ڕاستی و دروستی، زۆربەی سودی نییە، قسە لەسەرکردنی زیادەیە، بەڵام ئەوەی موسڵمانان پێویستیانە بیزانن بێگومان خوا ﷻ بەڵگەی لەسەر حەق و ڕەوایەتی داناوە.

هەموو ئەوەی ئوممەتی ئیسلام پێویستی پێیەتی بۆ تێگەیشتن لە مانا و مەبەستەکانی قورئانی پیرۆز بە بەڵگەی صەحیح و جێگیر بۆ موسڵمانان سەلماوە، ئەوەی لە هەندێك لە ئیسرائیلییاتەوە نەقڵکراوە ناتوانرێت ڕاست و دروستی بزانرێت زیادەی زانست و حوکمی لەسەر دانامەزرێت.

(فَمِثَالُ مَا لَا يُفِيدُ وَلَا دَلِيلَ عَلَي الصَّحِيحِ مِنْهُ اخْتِلَافُهُمْ فِي لَوْنِ كَلْبِ أَصْحَابِ الْكَهْفِ، وَفِي الْبَعْضِ الَّذِي ضَرَبَ بِهِ مُوسَي مِنْ الْبَقَرَةِ، وَفِي مِقْدَارِ سَفِينَةِ نُوحٍ وَمَا كَانَ خَشَبُهَا، وَفِي اسْمِ الْغُلَامِ الَّذِي قَتَلَهُ الْخَضِرُ.
وَنَحْوُ ذَلِكَ فَهَذِهِ الْأُمُورُ طَرِيقُ الْعِلْمِ بِهَا النَّقْلُ فَمَا كَانَ مِنْ هَذَا مَنْقُولًا نَقْلًا صَحِيحًا عَنْ النَّبِيِّ ﷺ - كَاسْمِ صَاحِبِ مُوسَي أَنَّهُ الْخَضِرُ - فَهَذَا مَعْلُومٌ، وَمَا لَمْ يَكُنْ كَذَلِكَ بَلْ كَانَ مِمَّا يُؤْخَذُ عَنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، - كَالْمَنْقُولِ عَنْ كَعْبٍ وَوَهْبٍ وَمُحَمَّدِ بْنِ إسْحَاقَ وَغَيْرِهِمْ مِمَّنْ يَأْخُذُ عَنْ أَهْلِ الْكِتَابِ - فَهَذَا لَا يَجُوزُ تَصْدِيقُهُ وَلَا تَكْذِيبُهُ إلَّا بِحُجَّةِ كَمَا ثَبَتَ فِي الصَّحِيحِ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: ((إذَا حَدَّثَكُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ فَلَا تُصَدِّقُوهُمْ وَلَا تُكَذِّبُوهُمْ فَإِمَّا أَنْ يُحَدِّثُوكُمْ بِحَقٍّ فَتُكَذِّبُوهُ وَإِمَّا أَنْ يُحَدِّثُوكُمْ بِبَاطِلِ فَتُصَدِّقُوهُ))[1]).

واتە: نموونەی ئەوەی سودی نییە و بەڵگەی صەحیح نییە پشت ڕاستی بکاتەوە، جیاوازییانە لە ڕەنگی سەگەکەی هاوەڵانی ئەشکەوت، و ئەو بەشەی مانگاکە کە

(١). أخرجه البخاري عن أبي هريرة ﷺ: كَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يَقْرَءُونَ التَّوْرَاةَ بِالْعِبْرَانِيَّةِ، وَيُفَسِّرُونَهَا بِالْعَرَبِيَّةِ لِأَهْلِ الْإِسْلَامِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَا تُصَدِّقُوا أَهْلَ الْكِتَابِ وَلَا تُكَذِّبُوهُمْ، وَ﴿قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا ١٣٦﴾(البَقَرَة)، الْآيَةَ.

پێغەمبەر موسا ﷷ کێشای بە هەندێکی تریدا، و ئەندازەی کەشتییەکەی پێغەمبەر نوح ﷷ و جۆری ئەو داری لێی دروستکراوە، و ناوی ئەو منداڵەی کە خزر کوشتی.

هاوشێوەی ئەمانە دەبێت بە نەقلْ بزانرێت، ئەوەی بە صەحیحی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەقڵکرابێت (وەك ناوی هاوەڵەکەی پێغەمبەر موسا کە خزرە) ئەمە زانراوە، ئەوەشی بەوشێوەیە نەبێت لە خاوەن کتێبەکانەوە وەرگیراوە، وەك ئەوەی لە کەعب و وەهەب و محمدی کوڕی ئیسحاق و جگە لەوانیشەوە ڕیوایەتکراوە کەلە خاوەن کتێبەکانەوە ڕیوایەتی دەکەن، ئەمە دروست نییە بەڕاست دابنرێت یان بە درۆ بخرێتەوە بە بەڵگە نەبێت، وەك لە پێغەمبەری خواوە ﷺ سەلماوە فەرموویەتی: ئەگەر خاوەن کتێبەکان قسەیان بۆ کردن نەبە ڕاستیان بزانن، و نەبە درۆیان بزانن، یان ئەوەیە قسەی حەقتان بۆ دەکەن ئێوە بە دووری دادەنێن یان ئەوەیە قسەی باتڵتان بۆ دەکەن بە ڕاستی دادەنێن.

ئەوەی لە هەندێك تەفسیرەکاندا هاتووە و لە ئیسرائیلییاتەوە وەرگیراوە، ئەگەر بەڵگە لە قورئان و سوننەتی صەحیح پشتڕاستی نەکردبێتەوە پشتی پێ نابەسترێت، ئوممەت بەشێوەیەکی گشتی بۆ پەرستشی پەروەردگاری ئیشی پێی نییە.

شێخی ئیسلام ئاماژە بە چەند نموونەیەك دەکات کە بەڵگەی صەحیح نەیسەلماندووە و ئوممەتیش پەرستشی لەسەر زانستی ئەوە نەوەستاوە، وەك ڕەنگی سەگەکەی هاوەڵانی ئەشکەوتەکە لەو ئایەتەدا کە دەفەرموێت: ﴿وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ

﴿وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ ۖ وَكَلْبُهُم بَٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِ ۚ لَوِ ٱطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ﴿١٨﴾﴾(الكَهْف).

واتە: ئەگەر هاوەڵانی ئەشکەوتت ببینیایە واگومانت دەبرد بێدارن، بەڵام خەوتبوون، ئێمە ئەمدیو و ئەودیویان پێدەکردین بە لای ڕاست و بەلای چەپدا، سەگەکەشیان لەبەر ڕێڕەوی دەروازەی ئەشکەوتەکە دەستەکانی ڕاکێشابوو، ئەگەر هاوەڵانی ئەشکەوتت ببینیایە پشتت هەڵدەکرد و بەڕاکردن هەڵدەهاتیت، دڵت پڕ دەبوو لە ترس و سەراپا لەشی داگیر دەکردیت.

لە هەندێك ڕیوایەتدا هاتووە ناوی سەگەکە: (ڕەیان، قەتمیر، تور، صەهبا، تەقی)، بووە، لە چەند ڕیوایەتێکدا هاتووە ڕەنگی: (سپی، زەرد، زەردی سورباو) بووە، ناو و ڕەنگی تر هاتووە، ناتوانرێت ساغ بکرێنەوە، هەروەها لە چەند ئایەتێکدا خوای پەروەردگار باسی کەشتییەکەی پێغەمبەر نوحی کردووە وەك دەفەرموێت: ﴿وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۚ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٣٧﴾﴾(هُود).

واتە: کەشتییەك دروست بکە بە پێش چاوی ئێمەوە و بە فەرمان و وەحی ئێمە، گفتوگۆم لەگەڵدا مەکە بۆ لێخۆشبوون لە ئەو کەسانەی ستەمیان کرد و باوەڕیان نەهێنا، چونکە بێگومان هەموویان ژێر ئاو دەکەون و دەخنکێن.

لە هەندێك ڕیوایەتدا هاتووە کەشتییەکەی لە داری ساج دروستکردووە، و درێژییەکەی چوار سەد باڵ بووە، هەروەها ناوی ئەو منداڵەی خزر کوشتی لەو ئایەتەدا

کە دەفەرموێت: ﴿فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمًا فَقَتَلَهُۥ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا ﴿٧٤﴾﴾( الكَهْف).

واتە: دیسان بەڕێکەوتن هەتا گەیشتن بە لاوێك خزر کوشتی، پێغەمبەر موسا فەرمووی: ئایا نەفسێکی پاکی بێتاوان دەکوژیت، بەبێ ئەوەی کەسی کوشتبێت، سوێندبێت کارێکی زۆر خراپی ناپەسەندت ئەنجامدا.

لە هەندێك ڕیوایەتدا هاتووە ناوی جەیسور بووە، شێخی ئیسلام ئەم نموونانەی هێناوە بۆ ئەو شتانەی زانینی سودی نییە و بەڵگەی صەحیحی لەسەر نییە.

(وَكَذَلِكَ مَا نُقِلَ عَنْ بَعْضِ التَّابِعِينَ وَإِنْ لَمْ يَذْكُرْ أَنَّهُ أَخَذَهُ عَنْ أَهْلِ الْكِتَابِ؛ فَمَتى اخْتَلَفَ التَّابِعُونَ لَمْ يَكُنْ بَعْضُ أَقْوَالِهِمْ حُجَّةً عَلى بَعْضٍ.

وَمَا نُقِلَ فِي ذَلِكَ عَنْ بَعْضِ الصَّحَابَةِ نَقْلًا صَحِيحًا فَالنَّفْسُ إلَيْهِ أَسْكَنُ مِمَّا نُقِلَ عَنْ بَعْضِ التَّابِعِينَ؛ لِأَنَّ احْتِمَالَ أَنْ يَكُونَ سَمِعَهُ مِنْ النَّبِيِّ ﷺ أَوْ مِنْ بَعْضِ مَنْ سَمِعَهُ مِنْهُ أَقْوَى، وَلِأَنَّ نَقْلَ الصَّحَابَةِ عَنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أَقَلُّ مِنْ نَقْلِ التَّابِعِينَ.

وَمَعَ جَزْمِ الصَّاحِبِ فِيمَا يَقُولُهُ فَكَيْفَ يُقَالُ إنَّهُ أَخَذَهُ عَنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَقَدْ نُهُوا عَنْ تَصْدِيقِهِمْ؟.

وَالْمَقْصُودُ أَنَّ مِثْلَ هَذَا الِاخْتِلَافِ الَّذِي لَا يُعْلَمُ صَحِيحُهُ وَلَا تُفِيدُ حِكَايَةُ الْأَقْوَالِ فِيهِ هُوَ كَالْمَعْرِفَةِ لِمَا يُرْوَى مِنْ الْحَدِيثِ الَّذِي لَا دَلِيلَ عَلَي صِحَّتِهِ وَأَمْثَالِ ذَلِكَ).

واتە: هەروەها ئەوەی لە هەندێك لە تابعییەکانەوە ڕیوایەتکراوە، ئەگەر باسی ئەوەش نەکات لە خاوەن کتێبەکانەوە وەریگرتووە، هەرکاتێك تابعییەکان ناکۆکبوون قسەی هەندێکیان بەڵگە نییە بەسەر هەندێکی تریانەوە.

و ئەوەی لە هەندێك لە هاوەڵانەوە ڕیوایەتکراوە بە صەحیحی دڵ پێ ئارامترە وەك ئەوەی لە تابعییەکانەوە ڕیوایەتکراوە؛ چونکە ئەگەری ئەوەی لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستبێت، یان لە هەندێك کەلە ئەوی بیستووە ئەگەرێکی بەهێزە، و لەبەر ئەوەی ڕیوایەتی هاوەڵان لە خاوەن کتێبەکانەوە کەمترە لەچاو ڕیوایەتی تابعییەکان.

لەگەڵ دڵنیایی لەوەی هاوەڵ گوتوویەتی، چۆن دەگوترێت ئەوەی لە خاوەن کتێبەکانەوە وەرگرتوە لە کاتێکدا یاساغییان لێکراوە بە ڕاستییان بزانن؟.

مەبەست ئەوەیە هاوشێوەی ئەم ناکۆکییە کە نازانرێت صەحیحە، و گێڕانەوەی بۆچوونەکان لەوبارەیەوە سودی نییە، وەك گێڕانەوەی ئەو فەرموودەیە بەڵگە نییە لەسەر صەحیحی و هاوشێوەی ئەوە.

زانراوە فەرموودە و ئەسەر هەتاکو سەنەدی عالی تربێت بە دوورترە لە عیلەت و نزیکترە لەوەی صەحیح تربێت، قسەی تابعییەك ئەگەر فەرموودەی صەحیح پاڵپشتی نەبێت بەڵگە نییە بەسەر تابعییەکی ترەوە، قسە و بۆچوونی هاوەڵان لە پێشترە لە قسە و بۆچوونی تابعییەکان، چونکە لەوانەیە لە پێغەمبەری خوایان ﷺ بیستبێت یان هاوەڵێکی ترەوە بیستبێتی و ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستبێت، زانراوە

پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێکردوون ئەوەی لە خاوەن کتێبەکانی دەبیستن بە ڕاستیان نەزانن و ڕەتی نەکەنەوە وەك دەفەرموێت: ((لَا تُصَدِّقُوا أَهْلَ الْكِتَابِ وَلَا تُكَذِّبُوهُمْ)).

واتە: خاوەن کتێبەکان بە ڕاست مەزانن و بە درۆشیان مەخەنەوە.

(وَأَمَّا "الْقِسْمُ الْأَوَّلُ" الَّذِي يُمْكِنُ مَعْرِفَةُ الصَّحِيحِ مِنْهُ فَهَذَا مَوْجُودٌ فِيمَا يُحْتَاجُ إلَيْهِ وَلِلَّهِ الْحَمْدُ فَكَثِيرًا مَا يُوجَدُ فِي التَّفْسِيرِ وَالْحَدِيثِ وَالْمَغَازِي أُمُورٌ مَنْقُولَةٌ عَنْ نَبِيِّنَا ﷺ وَغَيْرِهِ مِنْ الْأَنْبِيَاءِ صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِمْ وَسَلَامُهُ وَالنَّقْلُ الصَّحِيحُ يَدْفَعُ ذَلِكَ؛ بَلْ هَذَا مَوْجُودٌ فِيمَا مُسْتَنَدُهُ النَّقْلُ وَفِيمَا قَدْ يُعْرَفُ بِأُمُورِ أُخْرَى غَيْرِ النَّقْلِ، فَالْمَقْصُودُ أَنَّ الْمَنْقُولَاتِ الَّتِي يُحْتَاجُ إلَيْهَا فِي الدِّينِ قَدْ نَصَبَ اللَّهُ الْأَدِلَّةَ عَلى بَيَانِ مَا فِيهَا مِنْ صَحِيحٍ وَغَيْرِهِ).

واتە: جۆری یەکەم کە دەتوانرێت بزانرێت صەحیحە ئەمە بوونی هەیە لەوەی موسڵمانان پێویستیان پێیەتی، سوپاس بۆ خوا، زۆر جار لە تەفسیر و فەرموودە و باسی غەزاکاندا فەرموودە ڕیوایەتکراوە لە پێغەمبەرمانەوە ﷺ یان لە پێغەمبەرانی ترەوە عليهم السلام، بە صەحیحی هاتووە ئەوانە ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو ئەوەی بە فەرموودەی ڕیوایەتکراوە دەتوانرێت ماناکەی بزانرێت، و لەوانەیە بە هەندێك شتی تر بزانرێت جگە لە فەرموودەی ڕیوایەتکراو، مەبەستەکە ئەوەیە ئەو شتانەی ڕیوایەتکراوە و لە ئاییندا موسڵمانان پێویستیان پێی دەبێت، خوا ﷻ بەڵگەی داناوە صەحیح لە زەعیف و بێبنەما جیا دەکاتەوە و ڕوونی دەکاتەوە.

(وَمَعْلُومٌ أَنَّ الْمَنْقُولَ فِي التَّفْسِيرِ أَكْثَرُهُ كَالْمَنْقُولِ فِي الْمَغَازِي وَالْمَلَاحِمِ؛ وَلِهَذَا قَالَ الْإِمَامُ أَحْمَد ثَلَاثَةُ أُمُورٍ لَيْسَ لَهَا إسْنَادٌ: التَّفْسِيرُ وَالْمَلَاحِمُ وَالْمَغَازِي وَيُرْوَى لَيْسَ لَهَا أَصْلٌ أَيْ إسْنَادٌ؛ لِأَنَّ الْغَالِبَ عَلَيْهَا الْمَرَاسِيلُ مِثْلُ مَا يَذْكُرُهُ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ وَالشَّعْبِيُّ وَالزُّهْرِيُّ وَمُوسَى بْنُ عُقْبَةَ وَابْنُ إسْحَاقَ وَمَنْ بَعْدَهُمْ كَيَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ الْأُمَوِيِّ وَالْوَلِيدِ بْنِ مُسْلِمٍ والواقدي وَنَحْوِهِمْ فِي الْمَغَازِي، فَإِنَّ أَعْلَمَ النَّاسِ بِالْمَغَازِي أَهْلُ الْمَدِينَةِ، ثُمَّ أَهْلُ الشَّامِ، ثُمَّ أَهْلُ الْعِرَاقِ؛ فَأَهْلُ الْمَدِينَةِ أَعْلَمُ بِهَا لِأَنَّهَا كَانَتْ عِنْدَهُمْ، وَأَهْلُ الشَّامِ كَانُوا أَهْلَ غَزْوٍ وَجِهَادٍ فَكَانَ لَهُمْ مِنْ الْعِلْمِ بِالْجِهَادِ وَالسِّيَرِ مَا لَيْسَ لِغَيْرِهِمْ، وَلِهَذَا عَظَّمَ النَّاسُ كِتَابَ أَبِي إسْحَاقَ الفزاري الَّذِي صَنَّفَهُ فِي ذَلِكَ وَجَعَلُوا الأوزاعي أَعْلَمَ بِهَذَا الْبَابِ مِنْ غَيْرِهِ مِنْ عُلَمَاءِ الْأَمْصَارِ).

واتە: زانراوە ئەوەی ڕیوایەتکراوە لە تەفسیردا زیاترە لەوەی لە شەڕ و غەزاکاندا ڕیوایەتکراوە؛ لەبەر ئەوە ئیمام ئەحمەد دەڵێت: سێ شت سەنەدی نییە: تەفسیر و شەڕەکان و غەزاکان، و ڕیوایەتکراوە: کە ئەصلی نییە واتە: سەنەدی نییە؛ چونکە زۆبەی مورسەلە، بۆ نموونە عوروەی کوڕی زوبێر و شەعبی و زوهری و موسای کوڕی عوقبە و ئیبن ئیسحاق و ئەوانەی دوای ئەوان وەك یەحیای کوڕی سەعیدی ئومەوی و وەلیدی کوڕی مسلم و واقیدی و هاوەشێوە ئەو کەلە غەزاکاندا ڕیوایەتیان کردووە، بێگومان زاناترین خەڵك بە غەزاکان ئەهلی مەدینەن، پاشان ئەهلی شام، پاشان ئەهلی عێراق، ئەهلی مەدینە زاناترن لەبەر ئەوەی سەرچاوەکەی لای ئەوان بووە، و خەڵکی شام جەنگاوەر و ئەهلی جیهاد بوون بۆیە ئەو زانستەی بە جیهاد و سیرە هەیانبوو لای کەسانی تر نەبوو، لەبەر ئەوە خەڵك ئەو کتێبەی ئەبوئیسحاقی فەزاری نوسیویەتی بە گەورەیان دانا، و ئەوزاعییان لەم بابەتە بە زاناتر دانا لە زانایانی شارەکانی تر.

شێخی ئیسلام ئاماژە بۆ سێ مەدرەسە دەکات لە ڕیوایەتی غەزا و جەنگەکان، خەڵکی مەدینە بە شارەزاترین دادەنێت لەبەر ئەوەی لە سەردەمی هاوەڵاندا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ جیهادیان کردووە، پاشان لەگەڵ خەلیفە ڕاشدییەکان، دوای ئەوان خەڵکی شام شارەزاترن چونکە کۆمەڵێك لە زاناکانی هاوەڵان کۆچیان کرد بۆ شام لە سەردەمی موعاوییەی کوڕی ئەبوسوفییانەوە رضي الله عنهما بوو بە پایتەختی ئیسلام و جیهاد و تێکۆشانیان دژی بێباوەڕان و ڕۆمەکان کرد، پاشان خەڵکی عێراق.

ئیبن حەجەری عەسقەلانی لەسەر ئەو قسەی ئیمامی ئەحمەد کە دەڵێت: سێ شت سەنەدی نییە، دەڵێت: پێویستە (الفضائل)یشی بۆ زیاد بکرێت، ئەم چوار شتە شێوی فەرموودەی زەعیف و مەوزوعن، چونکە سەرچاوەی باسی غەزاکان لەسەر هاوشێوەی کەسێکی وەك واقیدییە، و تەفسیر سەرچاوەی موقاتل و کەلبییە، شەڕەکان و سەرچاوەی داستانەکان ئیسرائیلییاتە، لە فەزائیلدا ناژمێردرێت ڕافیزەکان چەندە درۆیان هەڵبەستووە لە فەزڵی ئەهلوبەیت، نەفامەکانی ئەهلی سوننەتیش پێچەوانەیان کردن سەرەتا بە فەزڵی موعاوییە پاشان بە فەزڵی ئەبوبەکر و عومەر، خوا سبحانه وتعالى بێ پێویستی کردوون و پلەوپایەیانی بەرزکردووەتەوە(١).

(وَأَمَّا "التَّفْسِيرُ" فَإِنَّ أَعْلَمَ النَّاسِ بِهِ أَهْلُ مَكَّةَ؛ لِأَنَّهُمْ أَصْحَابُ ابْنِ عَبَّاسٍ كَمُجَاهِدِ وَعَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ وَعِكْرِمَةَ مَوْلَي ابْنِ عَبَّاسٍ وَغَيْرِهِمْ مِنْ أَصْحَابِ ابْنِ عَبَّاسٍ كَطَاوُوسِ وَأَبِي الشَّعْثَاءِ وَسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ وَأَمْثَالِهِمْ.

(١). (لسان الميزان)(١/١٣).

وَكَذَلِكَ أَهْلُ الْكُوفَةِ مِنْهُ أَصْحَابُ ابْنِ مَسْعُودٍ وَمِنْ ذَلِكَ مَا تَمَيَّزُوا بِهِ عَلَي غَيْرِهِمْ.

وَعُلَمَاءُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ فِي التَّفْسِيرِ مِثْلُ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ الَّذِي أَخَذَ عَنْهُ مَالِكٌ التَّفْسِيرَ وَأَخَذَهُ عَنْهُ أَيْضًا ابْنُهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ وَأَخَذَهُ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ).

واتە: لە تەفسیر زاناترینی خەڵك بە تەفسیر خەڵکی مەککەن، لەبەر ئەوەی هاوەڵی ئیبن عەباس رضي الله عنهما بوون، وەك موجاهید و عەتای کوڕی ئەبورەباح و عیکرمەی مەولای ئیبن عەباس و هاوەڵانی تری ئیبن عەباس وەك تاوس و ئەبوشەعسا و سەعیدی کوڕی جوبەیر و هاوشێوەکانیان.

هەروەها ئەهلی کوفە شارەزان لە تەفسیردا کە هاوەڵانی ئیبن مەسعودن، و لەوەدا جیاوازن لە جگە لە خۆیان.

و زانایانی ئەهلی مەدینە لە تەفسیردا وەك زەیدی کوڕ ئەسلەم کە مالك تەفسیری لێ وەرگرتووە، و عبدالرحمانی کوڕی زەید تەفسیری لە باوکییەوە وەرگرتووە، و عبداللەی کوڕی وەهەب لە عبدالرحمانی کوڕی زەیدەوە وەریگرتووە.

شێخی ئیسلام ئاماژەی بۆ سێ مەدرەسەی تەفسیر کردووە:

یەکەم: مەدرەسەی مەککە کە پێشەوا و مامۆستای مەدرەسەکە ئیبن عەباسی زانای ئوممەتە لە تەفسیری قورئان بە فەزڵی دوعای پێغەمبەری خوا ﷺ کە بۆی پاڕاوەتەوە لە خوا فێری تەفسیر و لێکدانەوەی قورئانی بکات.

**دووەم: مەدرەسەی کوفە کە پێشەوا و مامۆستاکەی ئیبن مەسعودە رضي الله عنه .**

**سێیەم: مەدرەسەی مەدینە: کە پێشەوا و مامۆستاکەی ئوبەی کوڕی کەعبە.**

(و"الْمَرَاسِيلُ" إذَا تَعَدَّدَتْ طُرُقُهَا وَخَلَتْ عَنْ الْمُوَاطَأَةِ قَصْدًا أَوْ الِاتِّفَاقِ بِغَيْرِ قَصْدٍ كَانَتْ صَحِيحَةً قَطْعًا، فَإِنَّ النَّقْلَ إمَّا أَنْ يَكُونَ صِدْقًا مُطَابِقًا لِلْخَبَرِ وَإِمَّا أَنْ يَكُونَ كَذِبًا تَعَمَّدَ صَاحِبُهُ الْكَذِبَ أَوْ أَخْطَأَ فِيهِ؛ فَمَتَى سَلِمَ مِنْ الْكَذِبِ الْعَمْدِ وَالْخَطَإِ كَانَ صِدْقًا بِلَا رَيْبٍ، فَإِذَا كَانَ الْحَدِيثُ جَاءَ مِنْ جِهَتَيْنِ أَوْ جِهَاتٍ وَقَدْ عُلِمَ أَنَّ الْمُخْبِرَيْنِ لَمْ يَتَوَاطَآ عَلَى اخْتِلَاقِهِ وَعُلِمَ أَنَّ مِثْلَ ذَلِكَ لَا تَقَعُ الْمُوَافَقَةُ فِيهِ اتِّفَاقًا بِلَا قَصْدٍ عُلِمَ أَنَّهُ صَحِيحٌ .

مِثْلُ شَخْصٍ يُحَدِّثُ عَنْ وَاقِعَةٍ جَرَتْ وَيَذْكُرُ تَفَاصِيلَ مَا فِيهَا مِنْ الْأَقْوَالِ وَالْأَفْعَالِ وَيَأْتِي شَخْصٌ آخَرُ قَدْ عُلِمَ أَنَّهُ لَمْ يُوَاطِئْ الْأَوَّلَ فَيَذْكُرُ مِثْلَ مَا ذَكَرَهُ الْأَوَّلُ مِنْ تَفَاصِيلِ الْأَقْوَالِ وَالْأَفْعَالِ فَيُعْلَمُ قَطْعًا أَنَّ تِلْكَ الْوَاقِعَةَ حَقٌّ فِي الْجُمْلَةِ فَإِنَّهُ لَوْ كَانَ كُلٌّ مِنْهُمَا كَذَبَهَا عَمْدًا أَوْ خَطَأً لَمْ يَتَّفِقْ فِي الْعَادَةِ أَنْ يَأْتِيَ كُلٌّ مِنْهُمَا بِتِلْكَ التَّفَاصِيلِ الَّتِي تَمْنَعُ الْعَادَةُ اتِّفَاقَ الِاثْنَيْنِ عَلَيْهَا بِلَا مُوَاطَأَةٍ مِنْ أَحَدِهِمَا لِصَاحِبِهِ فَإِنَّ الرَّجُلَ قَدْ يَتَّفِقُ أَنْ يَنْظِمَ بَيْتًا وَيَنْظِمَ الْآخَرُ مِثْلَهُ أَوْ يَكْذِبَ كِذْبَةً وَيَكْذِبَ الْآخَرُ مِثْلَهَا أَمَّا إذَا أَنْشَأَ قَصِيدَةً طَوِيلَةً ذَاتَ فُنُونٍ عَلَى قَافِيَةٍ وَرَوِيٍّ فَلَمْ تَجْرِ الْعَادَةُ بِأَنَّ غَيْرَهُ يُنْشِئُ مِثْلَهَا لَفْظًا وَمَعْنًى مَعَ الطُّولِ الْمُفْرِطِ بَلْ يُعْلَمُ بِالْعَادَةِ أَنَّهُ أَخَذَهَا مِنْهُ وَكَذَلِكَ إذَا حَدَّثَ حَدِيثًا طَوِيلًا فِيهِ فُنُونٌ وَحَدَّثَ آخَرُ بِمِثْلِهِ فَإِنَّهُ إمَّا أَنْ يَكُونَ وَاطَأَهُ عَلَيْهِ أَوْ أَخَذَهُ مِنْهُ أَوْ يَكُونَ الْحَدِيثُ صِدْقًا).

**واتە: فەرمووده مورسەلەکان ئەگەر لە چەند ڕێگایەکەوە ڕیوایەت بکرێن، و بەدەربێت لە ڕێکەوتن و بەبێ مەبەست ئەوە هاتبێت بەدڵنیاییەوە صەحیحە، چونکە ئەوەی**

ڕیوایەت دەکرێت یان ڕاستە و هاوتایە بۆ باسکراوەکە یان درۆیە و خاوەنەکەی بە ئەنقەست درۆی کردووە یان هەڵەی کردووە، هەرکاتێك سەلامەت بێت لە درۆی ئەنقەست و هەڵە ئەوە بێگومان ڕاستە، ئەگەر فەرموودە لە دوو ڕێگا یان زیاترەوە بێت و بزانرێت ئەو دوو کەسەی باسیان کردووە ڕێکنەکەوتوون لەسەر ئەوەی بە درۆوە هەڵیبەستن، و بزانرێت ئەوەی ڕیوایەتکراوە شتێك نییە ڕێکەوتنی تێدا بکرێت بەبێ مەبەست، دەزانرێت ئەوەی ڕیوایەتکراوە صەحیحە.

بۆ نموونە کەسێك باسی ڕووداوێك بکات کە ڕوویداوە و بە درێژی باسی گوفتار و کردارەکان بکات، و کەسێکی تر بێت بزانرێت لەگەڵ کەسی یەکەم ڕێکنەکەوتووە و ئەوەی کەسی یەکەم باسی کرد باسی بکات و بە درێژی باسی گوفتار و کردارەکان بکات، دەزانرێت بەدڵنیاییەوە ئەو ڕووداوە بەشێوەیەکی گشتی حەقە و ڕوویداوە، چونکە ئەگەر هەریەکەیان بە درۆ و بە ئەنقەست هەڵیانبەستبێت یان هەڵەیان کردبێت، عادەت نییە هەریەکەیان ئەو وردەکارییە باسبکات، کە عادەت نییە دوو هاوتا باسی بکەن بەبێ ڕێکەوتنیان، چونکە ڕێك دەکەوێت کەسێك دێڕێك شیعرێك بڵێت، و کەسێکی تر دێڕێکی هاوتای ئەو بڵێت، یان درۆیەك بکات و ئەوی تر درۆیەکی هاوشێوەی بکات، بەڵام ئەگەر هۆنراوەیەکی درێژ لە چەند بوارێکدا بنوسێتەوە بە قافییە و کۆتای ڕێکەوە، عادەت نییە کەسێکی تر بە هەمان لەفز و مانا لەگەڵ درێژی زۆر هۆنراوەکە بنوسێتەوە، بەڵکو بە نەریت دەزانرێت لەوی تری وەرگرتووە، هەروەها ئەگەر قسە و باسێکی درێژ

دەربارەی چەند زانستێك بكات، و كەسێكی تر باسێكی هاوشێوەی بكات، یان ئەوەیە ڕێكەوتووە لەگەڵیدا یان لەوی وەرگرتووە یان ئەوەی باسكراوە ڕاستە.

وشەی مورسەل زاراوەیەكە بە فەرموودەیەك دەگوترێت هاوەڵێك یان تابعییەك بڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت، ئەگەر هاوەڵ لە هاوەڵێكەوە فەرموودە ڕیوایەت بكات و بڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت هیچ كێشەیەكی تێدا نییە، چونكە هاوەڵان هەموویان دادگەرن (عەدلن)، بۆ نموونە جابری كوڕی عبدالله رضي الله عنهما فەرموودەیەك ڕیوایەت بكات باسی سەردەمی مەككە بكات و باسی ئەو هاوەڵە نەكات بۆی گێڕاوەتەوە، ئەمە مورسەلەی هاوەڵە (مرسل الصحابي) چونكە جابر رضي الله عنه ئەنسارییە و دیارە ئەو باسەی لە هاوەڵێكی ترەوە بیستووە، بەڵام ئەگەر تابعییەك بڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت و باسی هاوەڵێك نەكات لێی بیستووە یان بۆی گێڕاوەتەوە و نەزانرێت ئەو تابعییە لە هاوەڵێكی بیستووە، شێخی ئیسلام لێرە باسی ڕێسایەك دەكات و دەڵێت: ئەگەر فەرموودەیەك قەرینە و بەڵگە هەبوو ئەو كەسەی ڕیوایەتی دەكات درۆ یان هەڵە ناكات، و باسێكی درێژ بێت و كەسێك یان زیاتر بەبێ ڕێكەوتن ئەو باسە بگێڕێتەوە و پوختەی باسەكانیان هاوتابێت، ئەو دوو ڕیوایەتە دەبنە پاڵپشتی یەكتر و ئەوەی ڕیوایەتكراوە بەهێزی دەكەن و دەزانرێت صەحیحە، بۆ نموونە: قەتادە هەواڵێكی درێژ لە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕیوایەت بكات، و سەعیدی كوڕی جوبەیریش هەواڵێكی هاوشێوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیوایەت بكات ئەو دوو ڕیوایەتە یەكتر بەهێز دەكەن

و دەزانرێت صەحیحە، صالح ئال شێخ وەك لە سەرەتا ئاماژەمان بۆ کرد باسی ئەوە دەکات ڕێساکانی (مصطلح حدیث) پیادە ناکرێت بە سەر ئەو ڕیوایەتانەی لە تەفسیردا ڕیوایەتکراوە بۆیە هەندێك ئاسانکاری دەکرێت لە ڕیوایەتەکانی تەفسیر، چونکە زانراوە فەرموودە ناسەکان ڕێوشوێنی توندتر دەگرنەبەر بۆ ساغکردنەوەی فەرموودەی صەحیح و زەعیف؛ جێگای ئاماژە پێدانە فەرموودەی مورسەل لای فەرموودەناسەکان لە جۆری زەعیفە، چونکە زانراوە یەکێك لە مەرجەکانی فەرموودەی صەحیحی تێدا نییە و سەنەدەکەی پچڕانی تێدایە و موتەصل نییە.

(وَبِهَذِهِ الطَّرِيقِ يُعْلَمُ صِدْقُ عَامَّةِ مَا تَتَعَدَّدُ جِهَاتُهُ الْمُخْتَلِفَةُ عَلَى هَذَا الْوَجْهِ مِنْ الْمَنْقُولَاتِ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ أَحَدُهَا كَافِيًا إمَّا لِإِرْسَالِهِ وَإِمَّا لِضَعْفِ نَاقِلِهِ؛ لَكِنْ مِثْلُ هَذَا لَا تُضْبَطُ بِهِ الْأَلْفَاظُ وَالدَّقَائِقُ الَّتِي لَا تُعْلَمُ بِهَذِهِ الطَّرِيقِ فَلَا يَحْتَاجُ ذَلِكَ إلَى طَرِيقٍ يَثْبُتُ بِهَا مِثْلُ تِلْكَ الْأَلْفَاظِ وَالدَّقَائِقِ؛ وَلِهَذَا ثَبَتَتْ بِالتَّوَاتُرِ غَزْوَةُ بَدْرٍ وَأَنَّهَا قَبْلَ أُحُدٍ بَلْ يُعْلَمُ قَطْعًا أَنَّ حَمْزَةَ وَعَلِيًّا وَعُبَيْدَةَ بَرَزُوا إلَى عتبة وَشَيْبَةَ وَالْوَلِيدِ، وَأَنَّ عَلِيًّا قَتَلَ الْوَلِيدَ وَأَنَّ حَمْزَةَ قَتَلَ قِرْنَهُ ثُمَّ يُشَكُّ فِي قِرْنِهِ هَلْ هُوَ عتبة أَوْ شَيْبَةُ.

وَهَذَا الْأَصْلُ يَنْبَغِي أَنْ يُعْرَفَ فَإِنَّهُ أَصْلٌ نَافِعٌ فِي الْجَزْمِ بِكَثِيرِ مِنْ الْمَنْقُولَاتِ فِي الْحَدِيثِ وَالتَّفْسِيرِ وَالْمَغَازِي وَمَا يُنْقَلُ مِنْ أَقْوَالِ النَّاسِ وَأَفْعَالِهِمْ وَغَيْرِ ذَلِكَ).

واتە: بەم ڕێگایە ڕاستی زۆربەی ئەو ڕیوایەتانە دەزانیت کەلە چەند ڕێگایەکی جیاوازەوە هاتووە، ئەگەرچی یەکێك لە ڕێگاکانی بەس نەبێت لەبەر ئەوەی مورسەلە یان لەبەر زەعیفی ئەو کەسەی ڕیوایەتی کردووە؛ بەڵام هاوشێوەی ئەمە لەفزەکانی بە وردی پێ ڕێکناخرێت، پێویست نییە ڕێگایەك هەبێت ئەو لەفز و وردەکارییانە

بسەلمێنێت، لەبەر ئەوە بە متەواتری جێگیر بووە غەزای بەدر پێش ئوحودە، بەڵکو بەدڵنیاییەوە دەزانرێت حەمزە و عەلی و عوبەیدە زۆرانبازی و شەڕە شمشێریان لەگەڵ عوتبە و شەیبە و وەلیددا کردووە، و عەلی وەلیدی کوشتووە، و حەمزە هاوتاکەی خۆی کوشتووە پاشان گومان هەیە عوتبە و شەیبە کامیان لەگەڵیدا جەنگاون.

ئەم بنەمایە پێویستە بزانرێت چونکە بنەمایەکی بەسودە بۆ بڕیاردان لەسەر زۆربەی ڕیوایەتەکانی فەرموودە و تەفسیر و غەزاکان و ئەوەی لە گوفتار و کرداری خەڵکەوە دەگێڕدرێتەوە و جگە لەوانەش.

(وَلِهَذَا إذَا رُوِيَ الْحَدِيثُ الَّذِي يَتَأَتَّي فِيهِ ذَلِكَ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ وَجْهَيْنِ مَعَ الْعِلْمِ بِأَنَّ أَحَدَهُمَا لَمْ يَأْخُذْهُ عَنْ الْآخَرِ جُزِمَ بِأَنَّهُ حَقٌّ، لَا سِيَّمَا إذَا عُلِمَ أَنَّ نَقَلَتَهُ لَيْسُوا مِمَّنْ يَتَعَمَّدُ الْكَذِبَ وَإِنَّمَا يُخَافُ عَلَي أَحَدِهِمْ النِّسْيَانُ وَالْغَلَطُ؛ فَإِنَّ مَنْ عَرَفَ الصَّحَابَةَ كَابْنِ مَسْعُودٍ وأبي بْنِ كَعْبٍ وَابْنِ عُمَرَ وَجَابِرٍ وَأَبِي سَعِيدٍ وَأَبِي هُرَيْرَةَ وَغَيْرِهِمْ عَلِمَ يَقِينًا أَنَّ الْوَاحِدَ مِنْ هَؤُلَاءِ لَمْ يَكُنْ مِمَّنْ يَتَعَمَّدُ الْكَذِبَ عَلَي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَضْلًا عَمَّنْ هُوَ فَوْقَهُمْ كَمَا يَعْلَمُ الرَّجُلُ مِنْ حَالِ مَنْ جَرَّبَهُ وَخَبَرَهُ خِبْرَةً بَاطِنَةً طَوِيلَةً أَنَّهُ لَيْسَ مِمَّنْ يَسْرِقُ أَمْوَالَ النَّاسِ وَيَقْطَعُ الطَّرِيقَ وَيَشْهَدُ بِالزُّورِ وَنَحْوِ ذَلِكَ).

واتە: لەبەر ئەوە ئەگەر فەرموودە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیوایەت بکرێت لە دوو ڕێگاوە و بزانرێت یەکێکیان لەوی تریان وەری نەگرتووە، جەخت دەکرێتەوە کە حەقە، بەتایبەت ئەگەر بزانرێت ئەوانەی گێڕاویانەتەوە لەو کەسانەنین بە ئەنقەست درۆ دەکەن بەڵکو ترسی ئەوەیە هەیە کەسێکیان لەبیری بچێتەوە یان هەڵە بکات، چونکە بێگومان

هەرکەسێك هاوەڵانی وەك ئیبن مەسعود و ئوبەی کوڕی کەعب و ئیبن عومەر و جابر و ئەبوسەعید و ئەبوهورەیرە و جگە لەوانیش بناسێت دڵنیا دەبێت دەزانێت کەسێك لەو هاوەڵانە لەو کەسانە نەبوون بە ئەنقەست درۆ بکەن بە ناوی پێغەمبەری خواوە ﷺ، چجای ئەوانەی پلەوپایەیان بەرزترە زیاتر دوورترن لەوەوە، وەك چۆن حاڵی کەسێك دەزانرێت لەلایەن کەسێکەوە تاقیکردبێتەوە و شارەزای ناخی بێت ماوەیەکی زۆر، و بزانێت لەو کەسانە نییە ماڵی خەڵك دەدزێت و ڕێگا دەگرێت و شایەتی درۆ دەدات و هاوشێوەی ئەوانە.

(وَكَذَلِكَ التَّابِعُونَ بِالْمَدِينَةِ وَمَكَّةَ وَالشَّامِ وَالْبَصْرَةِ فَإِنَّ مَنْ عَرَفَ مِثْلَ أَبِي صَالِحٍ السَّمَّانِ وَالْأَعْرَجِ وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ وَزَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ وَأَمْثَالِهِمْ عَلِمَ قَطْعًا أَنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا مِمَّنْ يَتَعَمَّدُ الْكَذِبَ فِي الْحَدِيثِ فَضْلًا عَمَّنْ هُوَ فَوْقَهُمْ مِثْلِ مُحَمَّدِ بْنِ سيرين وَالْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ أَوْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ أَوْ عُبَيْدَةَ السلماني أَوْ عَلْقَمَةَ أَوْ الْأَسْوَدِ أَوْ نَحْوِهِمْ).

واتە: هەروەها تابعییەکان لە مەدینە و مەککە و شام و بەسرە؛ بێگومان هەرکەسێك کەسانی وەك ئەبوصالحی سەمان و ئەعرەج و سولەیمانی کوڕی یەسار و زەیدی کوڕی ئەسلەم و هاوشێوەیان بناسێت بەدڵنیاییەوە دەزانێت لەو کەسانەنین بە ئەنقەست درۆ دەکەن لە فەرموودەدا، چجای ئەوانەی پلەوپایەیان بەرزترە زیاتر دوورترن لەوەوە، بۆ نموونە: محمدی کوڕی سیرین و قاسمی کوڕی محمد یان سەعیدی کوڕی موسەیەب یان عوبەیدەی سەمانی یان عەلقەمە یا ئەسوەد و هاوشێوەکانیان.

(وَإِنَّمَا يُخَافُ عَلَى الْوَاحِدِ مِنْ الْغَلَطِ؛ فَإِنَّ الْغَلَطَ وَالنِّسْيَانَ كَثِيرًا مَا يَعْرِضُ لِلْإِنْسَانِ وَمِنْ الْحُفَّاظِ مَنْ قَدْ عَرَفَ النَّاسُ بُعْدَهُ عَنْ ذَلِكَ جِدًّا كَمَا عَرَفُوا حَالَ الشَّعْبِيِّ وَالزُّهْرِيِّ وَعُرْوَةَ وقتادة وَالثَّوْرِيِّ وَأَمْثَالِهِمْ لَاسِيَّمَا الزُّهْرِيُّ فِي زَمَانِهِ وَالثَّوْرِيُّ فِي زَمَانِهِ فَإِنَّهُ قَدْ يَقُولُ الْقَائِلُ: إنَّ ابْنَ شِهَابٍ الزُّهْرِيَّ لَا يُعْرَفُ لَهُ غَلَطٌ مَعَ كَثْرَةِ حَدِيثِهِ وَسَعَةِ حِفْظِهِ).

واتە: بەڵام بێگومان ترسی هەڵەکردن لە یەکێك هەیە، چونکە هەڵە و لەبیرچوونەوە زۆرجار تووشی مرۆڤ دەبێت، و لە حافزەکان کەسانی واهەیە خەڵك زۆر لە درۆکردن بە دووری دەیبینن وەك چۆن حاڵی شەعبی و زوهری و عوروە و قەتادە و سەوری و هاوشێوەی ئەوانەیان زانیوە، بەتایبەت زوهری لەسەردەمی خۆی، و سەوری لەسەردەمی خۆی، چونکە لەوانەیە کەسێك بڵێت: ئیبن شەهابی زوهری هەڵەیەکی لێوە نەزانراوە لەگەڵ ئەوەی فەرموودەی زۆرە و لەبەرکردنی زۆر فراوان بووە.

(والْمَقْصُودُ أَنَّ الْحَدِيثَ الطَّوِيلَ إذَا رُوِيَ مَثَلًا مِنْ وَجْهَيْنِ مُخْتَلِفَيْنِ مِنْ غَيْرِ مُوَاطَأَةٍ امْتَنَعَ عَلَيْهِ أَنْ يَكُونَ غَلَطًا كَمَا امْتَنَعَ أَنْ يَكُونَ كَذِبًا؛ فَإِنَّ الْغَلَطَ لَا يَكُونُ فِي قِصَّةٍ طَوِيلَةٍ مُتَنَوِّعَةٍ وَإِنَّمَا يَكُونُ فِي بَعْضِهَا فَإِذَا رَوَى هَذَا قِصَّةً طَوِيلَةً مُتَنَوِّعَةً وَرَوَاهَا الْآخَرُ مِثْلَمَا رَوَاهَا الْأَوَّلُ مِنْ غَيْرِ مُوَاطَأَةٍ امْتَنَعَ الْغَلَطُ فِي جَمِيعِهَا كَمَا امْتَنَعَ الْكَذِبُ فِي جَمِيعِهَا مِنْ غَيْرِ مُوَاطَأَةٍ؛ وَلِهَذَا إنَّمَا يَقَعُ فِي مِثْلِ ذَلِكَ غَلَطٌ فِي بَعْضِ مَا جَرَي فِي الْقِصَّةِ مِثْلِ حَدِيثِ اشْتِرَاءِ النَّبِيِّ ﷺ الْبَعِيرَ مِنْ

جَابِرٍ[١]؛ فَإِنَّ مَنْ تَأَمَّلَ طُرُقَهُ عَلِمَ قَطْعًا أَنَّ الْحَدِيثَ صَحِيحٌ وَإِنْ كَانُوا قَدْ اخْتَلَفُوا فِي مِقْدَارِ الثَّمَنِ).

واتە: مەبەست ئەوەیە ئەگەر فەرموودەیەکی درێژ لە دوو ڕێگاوە بۆ نموونە ڕیوایەت بکرێت بەبێ ڕێککەوتن، ناشێت هەڵە بێت هەروەها ناشێت درۆبێت، چونکە ناشێت هەڵە لە باسێکی درێژی جۆراوجۆردا هەبێت، بەڵکو لە هەندێکیدا دەشێت ڕووبدات، ئەگەر یەکێکیان باسێکی درێژی جۆراوجۆر ڕیوایەت بکات، و کەسێکی تر بەهەمان شێوەی کەسی یەکەم بەبێ ڕێککەوتن ڕیوایەتی بکات ناشێت هەڵە لە هەموویدا ڕووبدات، وەك چۆن ناشێت هەمووی درۆ بێت بەبێ ڕێککەوتنیان، لەبەر ئەوە هەڵە ڕوو دەدات لە

(١). عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: ((كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي غَزَاةٍ، فَأَبْطَأَ بِي جَمَلِي وَأَعْيَا، فَأَتَى عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: جَابِرٌ، فَقُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: مَا شَأْنُكَ، قُلْتُ: أَبْطَأَ عَلَيَّ جَمَلِي وَأَعْيَا فَتَخَلَّفْتُ، فَنَزَلَ يَحْجُنُهُ بِمِحْجَنِهِ، ثُمَّ قَالَ: ارْكَبْ، فَرَكِبْتُ، فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ أَكُفُّهُ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، قَالَ: تَزَوَّجْتَ، قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: بِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا، قُلْتُ: بَلْ ثَيِّبًا، قَالَ: أَفَلَا جَارِيَةً تُلَاعِبُهَا وَتُلَاعِبُكَ، قُلْتُ: إِنَّ لِي أَخَوَاتٍ، فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَتَزَوَّجَ امْرَأَةً تَجْمَعُهُنَّ وَتَمْشُطُهُنَّ، وَتَقُومُ عَلَيْهِنَّ، قَالَ: أَمَا إِنَّكَ قَادِمٌ، فَإِذَا قَدِمْتَ فَالْكَيْسَ الْكَيْسَ، ثُمَّ قَالَ: أَتَبِيعُ جَمَلَكَ، قُلْتُ: نَعَمْ، فَاشْتَرَاهُ مِنِّي بِأُوقِيَّةٍ، ثُمَّ قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَبْلِي، وَقَدِمْتُ بِالْغَدَاةِ، فَجِئْنَا إِلَى الْمَسْجِدِ فَوَجَدْتُهُ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، قَالَ: آلْآنَ قَدِمْتَ، قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَدَعْ جَمَلَكَ، فَادْخُلْ، فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ، فَدَخَلْتُ فَصَلَّيْتُ، فَأَمَرَ بِلَالًا أَنْ يَزِنَ لَهُ أُوقِيَّةً، فَوَزَنَ لِي بِلَالٌ فَأَرْجَحَ فِي الْمِيزَانِ، فَانْطَلَقْتُ حَتَّى وَلَّيْتُ، فَقَالَ: ادْعُ لِي جَابِرًا، قُلْتُ: الْآنَ يَرُدُّ عَلَيَّ الْجَمَلَ، وَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ أَبْغَضَ إِلَيَّ مِنْهُ، قَالَ: خُذْ جَمَلَكَ وَلَكَ ثَمَنُهُ)).

وَقَالَ عُبَيْدُ اللهِ وَابْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ وَهْبٍ، عَنْ جَابِرٍ: اشْتَرَاهُ النَّبِيُّ ﷺ بِوَقِيَّةٍ وَتَابَعَهُ زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ، عَنْ جَابِرٍ وَقَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ وَغَيْرِهِ، عَنْ جَابِرٍ: أَخَذْتُهُ بِأَرْبَعَةِ دَنَانِيرَ؛ وَهَذَا يَكُونُ وَقِيَّةً عَلَى حِسَابِ الدِّينَارِ بِعَشَرَةِ دَرَاهِمَ، وَلَمْ يُبَيِّنِ الثَّمَنَ مُغِيرَةُ، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ جَابِرٍ وَابْنُ الْمُنْكَدِرِ وَأَبُو الزُّبَيْرِ عَنْ جَابِرٍ، وَقَالَ الْأَعْمَشُ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ جَابِرٍ: وَقِيَّةُ ذَهَبٍ؛ وَقَالَ أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ جَابِرٍ: بِمِائَتَيْ دِرْهَمٍ؛ وَقَالَ دَاوُدُ بْنُ قَيْسٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ مِقْسَمٍ، عَنْ جَابِرٍ: اشْتَرَاهُ بِطَرِيقِ تَبُوكَ، أَحْسِبُهُ قَالَ: بِأَرْبَعِ أَوَاقٍ وَقَالَ أَبُو نَضْرَةَ، عَنْ جَابِرٍ: اشْتَرَاهُ بِعِشْرِينَ دِينَارًا؛ وَقَوْلُ الشَّعْبِيِّ بِوَقِيَّةٍ أَكْثَرُ الِاشْتِرَاطُ، أَكْثَرُ وَأَصَحُّ عِنْدِي؛ قَالَهُ أَبُو عَبْدِ اللهِ، يعني البخاري.

هەندێك لەوەی لە باسەكەدا ڕوویداوە، نموونەی فەرموودەی كڕینی حوشترەكەی جابر لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ، چونكە ئەگەر كەسێك لە ڕێگاكانی بكۆڵێتەوە بەدڵنیاییەوە دەزانێت فەرموودەكە صەحیحە، ئەگەرچی ناكۆكیشبن لە بڕی پارەكەی.

(وَقَدْ بَيَّنَ ذَلِكَ الْبُخَارِيُّ فِي صَحِيحِهِ فَإِنَّ جُمْهُورَ مَا فِي الْبُخَارِيِّ وَمُسْلِمٍ مِمَّا يُقْطَعُ بِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَهُ؛ لِأَنَّ غَالِبَهُ مِنْ هَذَا النَّحْوِ؛ وَلِأَنَّهُ قَدْ تَلَقَّاهُ أَهْلُ الْعِلْمِ بِالْقَبُولِ وَالتَّصْدِيقِ وَالْأُمَّةُ لَا تَجْتَمِعُ عَلَي خَطَإٍ؛ فَلَوْ كَانَ الْحَدِيثُ كَذِبًا فِي نَفْسِ الْأَمْرِ؛ وَالْأُمَّةُ مُصَدِّقَةٌ لَهُ قَابِلَةٌ لَهُ لَكَانُوا قَدْ أَجْمَعُوا عَلَي تَصْدِيقِ مَا هُوَ فِي نَفْسِ الْأَمْرِ كَذِبٌ، وَهَذَا إجْمَاعٌ عَلَي الخطأ، وَذَلِكَ مُمْتَنِعٌ وَإِنْ كُنَّا نَحْنُ بِدُونِ الْإِجْمَاعِ نُجَوِّزُ الْخَطَأَ أَوْ الْكَذِبَ عَلَي الْخَبَرِ فَهُوَ كَتَجْوِيزِنَا قَبْلَ أَنْ نَعْلَمَ الْإِجْمَاعَ عَلَي الْعِلْمِ الَّذِي ثَبَتَ بِظَاهِرِ أَوْ قِيَاسٍ ظَنِّيٍّ أَنْ يَكُونَ الْحَقُّ فِي الْبَاطِنِ؛ بِخِلَافِ مَا اعْتَقَدْنَاهُ، فَإِذَا أَجْمَعُوا عَلَي الْحُكْمِ جَزَمْنَا بِأَنَّ الْحُكْمَ ثَابِتٌ بَاطِنًا وَظَاهِرًا).

واتە: بوخاری ئەوەی لە صەحیحەكەیدا ڕوونی كردووەتەوە، چونكە زۆربەی ئەوەی لە بوخاری و موسلمدا هاتووە جەخت دەكرێتەوە لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی؛ چونكە زۆربەی لەم جۆرەیە، و لەبەر ئەوەی ئەهلی عیلم قەبوڵیان كردووە و بەڕاستیان داناوە و ئوممەت لەسەر هەڵە كۆ نابێتەوە؛ ئەگەر فەرموودەیەك درۆ بووایە و ئوممەت لە بەرامبەردا بەڕاستی دانابێت، ئەو كاتە لەسەر بەڕاستدانانی شتێك كۆڕا دەبوون كە درۆیە، ئەمەش ئیجماعە لەسەر هەڵە، ئەوەش ناشێت، ئەگەرچی ئێمە بەبێ ئیجماع هەڵە یان درۆ بوونی هەواڵ بە جائز دەزانین و دەشێت هەواڵێك ڕاست نەبێت، ئەوە وەك بە جائیز زانینمانە پێش ئەوەی بزانین زانایان ئیجماعیان كردووە لەسەر ئەو

شتەی بە ڕواڵەت یان بە قیاسێکی زەنی کە حەقی لەخۆ گرتوە، بە پێچەوانەی ئەوەی بیروباوەڕمان بوو، ئەگەر ئیجماعیان کرد لەسەر حوکمێك جەخت دەکەینەوە ئەو حوکمە جێگیرە لە ناخدا و لە ڕواڵەتیشدا.

صالح ئال الشيخ دەڵێت: ئەمە درێژە پێدانی باسێکە پەیوەندییەکی بەهێزی نییە بە ئوصولی تەفسیرەوە، شێخی ئیسلام دەیەوێت ئەوە بسەلمێنێت ئەو ڕیوایەتەی پشت ڕاستکراوە لەوانەیە هەڵەی تێدابێت، واتە: ئەگەری هەڵە لە ڕیوایەتی ئەو ڕاوییەی ڕیوایەتی تەفسیر دەکات مانای ئەوە نییە تەفسیرەکەی قەبوڵ ناکرێت، چونکە ئەو ڕیوایەتەی ڕەت دەکرێتەوە ڕیوایەتی ئەو کەسانەیە بە ئەنقەست درۆ دەکەن، زۆربەی ئەوانەی تەفسیر ڕیوایەت دەکەن بە ئەنقەست درۆ ناکەن، بەتایبەت لە هاوەڵان و تابعییەکان، و زۆرێك لە تابعی تابعییەکان.

بەڵام هەڵە دەشێت کەسێکیان هەڵە بکەن، هەڵە و لەبیرچوون تووشی مرۆڤ دەبێت، بەڵام ئەو هەڵە و لەبیرچوونە لە چیرۆکە درێژەکاندایە، ئەگەر تابعییەك چیرۆکێکی درێژ لە تەفسیردا ڕیوایەت بکات یان هاوەڵێك، پاشان کەسێکی تر ڕیوایەتی بکات، زانستێك بەدەست دێت بە ڕیوایەتی بنەڕەتی باسەکە[(١)].

(وَلِهَذَا كَانَ جُمْهُورُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ جَمِيعِ الطَّوَائِفِ عَلَي أَنَّ "خَبَرَ الْوَاحِدِ" إذَا تَلَقَّتْهُ الْأُمَّةُ بِالْقَبُولِ تَصْدِيقًا لَهُ أَوْ عَمَلًا بِهِ أَنَّهُ يُوجِبُ الْعِلْمَ).

---

(١).بڕوانە: (شرح مقدمة أصول التفسير)(٨٦).

واتە: لەبەر ئەوە جمهوری زانایان لە هەموو تائیفەکان لەسەر ئەوەن خەبەری ئاحاد ئەگەر ئوممەت قەبوڵی کرد و بە ڕاستی زانی یان کردەوەی پێکرد، دڵنیا دەبن زانست دەگەیەنێت.

(وَهَذَا هُوَ الَّذِي ذَكَرَهُ الْمُصَنِّفُونَ فِي أُصُولِ الْفِقْهِ مِنْ أَصْحَابِ أَبِي حَنِيفَةَ وَمَالِكٍ وَالشَّافِعِيِّ وَأَحْمَد إلَّا فِرْقَةً قَلِيلَةً مِنْ الْمُتَأَخِّرِينَ اتَّبَعُوا فِي ذَلِكَ طَائِفَةً مِنْ أَهْلِ الْكَلَامِ أَنْكَرُوا ذَلِكَ؛ وَلَكِنَّ كَثِيرًا مِنْ أَهْلِ الْكَلَامِ أَوْ أَكْثَرِهِمْ يُوَافِقُونَ الْفُقَهَاءَ وَأَهْلَ الْحَدِيثِ وَالسَّلَفَ عَلَى ذَلِكَ وَهُوَ قَوْلُ أَكْثَرِ الْأَشْعَرِيَّةِ كَأَبِي إسْحَاقَ وَابْنِ فورك. وَأَمَّا ابْنُ الباقلاني فَهُوَ الَّذِي أَنْكَرَ ذَلِكَ وَتَبِعَهُ مِثْلُ أَبِي الْمَعَالِي وَأَبِي حَامِدٍ وَابْنِ عَقِيلٍ وَابْنِ الْجَوْزِيِّ وَابْنِ الْخَطِيبِ[1] والآمدي وَنَحْوِ هَؤُلَاءِ).

واتە: ئەمە نوسەرەکانی ئوصولی فیقھ باسیان کردووە لە هاوەڵانی ئەبوحەنیفە و مالك و شافعی و ئەحمەد، جگە لە کۆمەڵێکی کەم نەبێت لە زانایانی موتەئەخرین لەوەدا شوێنی کۆمەڵێك لە ئەهلی کەلام کەوتوون و نکۆڵی ئەوەیان کردووە؛ بەڵام زۆرێك لە ئەهلی کەلام یان زۆرینەیان هاوڕای فەقیهەکان و ئەهلی حەدیس و سەلەفن لەوەدا ئەوەش بۆچوونی زۆربەی ئەشعەرییەکانە وەك ئەبوئیسحاق و ئیبن فورك.

بەڵام ئیبن باقیلانی نکۆڵی ئەوەی کردووە و ئەبومەعالی و ئەبوحامد و ئیبن عەقیل و ئیبن جەوزی و ئیبن خەتیب و ئامیدی و هاوشێوەی ئەوان شوێنی کەوتوون.

---

(١).صالح ئال الشيخ دەڵێت: (ابن الخطيب) مەبەستی ڕازییە، چونکە لە زۆر کتێبدا بە ئیبن الخطیب ناودەبرێت، چونکە باوکی خەتیب بووە لە شاری ڕەی.

(وَالْأَوَّلُ هُوَ الَّذِي ذَكَرَهُ الشَّيْخُ أَبُو حَامِدٍ وَأَبُو الطَّيِّبِ وَأَبُو إِسْحَاقَ وَأَمْثَالُهُ مِنْ أَئِمَّةِ الشَّافِعِيَّةِ وَهُوَ الَّذِي ذَكَرَهُ الْقَاضِي عَبْدُ الْوَهَّابِ وَأَمْثَالُهُ مِنْ الْمَالِكِيَّةِ وَهُوَ الَّذِي ذَكَرَهُ أَبُو يَعْلَى وَأَبُو الْخَطَّابِ وَأَبُو الْحَسَنِ بْنُ الزاغوني وَأَمْثَالُهُمْ مِنْ الْحَنْبَلِيَّةِ، وَهُوَ الَّذِي ذَكَرَهُ شَمْسُ الدِّينِ السَّرَخْسِيُّ وَأَمْثَالُهُ مِنْ الْحَنَفِيَّةِ.

وَإِذَا كَانَ الْإِجْمَاعُ عَلَى تَصْدِيقِ الْخَبَرِ مُوجِبًا لِلْقَطْعِ بِهِ فَالِاعْتِبَارُ فِي ذَلِكَ بِإِجْمَاعِ أَهْلِ الْعِلْمِ بِالْحَدِيثِ، كَمَا أَنَّ الِاعْتِبَارَ فِي الْإِجْمَاعِ عَلَى الْأَحْكَامِ بِإِجْمَاعِ أَهْلِ الْعِلْمِ بِالْأَمْرِ وَالنَّهْيِ وَالْإِبَاحَةِ).

واتە: یەکەم ئەوەیە شێخ ئەبوحامد و ئەبوتەیب و ئەبوئیسحاق و هاوشێوەکانیان لە پێشەوا شافعی مەزهەبەکان باسیان کردووە، ئەوەش قازی عبدالوهاب و هاوشێوەکانی لە مالکییەکان باسیان کردووە، و ئەبویەعلا و ئەبوخەتاب و ئەبوحەسەنی کوڕی زاغونی و هاوشێوەکانیان لە حەنبەلییەکان باسیان کردووە، هەروەها شەمسەالدین سەرخەسی و هاوشێوەکانیان لە حەنەفییەکان باسیان کردووە.

ئەگەر ئیجماع لەسەر ڕاستی هەواڵێك پێویستی بکات بسەلمێنرێت و دانی پێدابنرێت، لەوەدا ئیعتبار بە ئیجماعی زانایانی فەرموودەیە، وەك چۆن لە حوکمەکاندا ئیعتبار بۆ ئیجماعی زانایانە بە فەرمان و یاساغی و حەڵاڵی.

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: مەبەستی نوسەر ﵀ ئەوەیە ئیجماعی هەموو زانستێك ئیعتبار بە زانایانی ئەو زانستەیە، بۆ نموونە لە زانستی فەرموودە ناسیدا دەگەڕێنەوە بۆ ئیجماعی فەرموودەناسەکان؛ ئەگەر فەرموودەناسەکان کۆڕابوون لەسەر ئەوەی هەواڵی ئاحاد قەبوڵ دەکرێت و قەرائنی بۆ زیادکرا زانست دەگەیەنێت، ئەو کاتە گرنگ نییە

فەقیهەکان ناکۆکییانبن...هەروەها ئیجماع لە پرسێکی نەحویدا ئیعتبار بە نەحو زانەکانە...ئەگەر کەسێك پێمان بڵێت: فەقیهەکان و ئەهلی کەلام بۆچوونیان پێچەوانەیە لە خەبەری ئاحاد و دەڵێن: زانست ناگەیەنێت، پێیان دەڵێین: پێچەوانەبوونی ئێوە گرنگ نییە بەلامانەوە، بەڵکو ئێمە دەڕوانینە ئیجماعی فەرموودەناسەکان[١].

(والْمَقْصُودُ هُنَا: أَنَّ تَعَدُّدَ الطُّرُقِ مَعَ عَدَمِ التَّشَاعُرِ أَوْ الِاتِّفَاقِ فِي الْعَادَةِ يُوجِبُ الْعِلْمَ بِمَضْمُونِ الْمَنْقُولِ؛ لَكِنَّ هَذَا يُنْتَفَعُ بِهِ كَثِيرًا فِي عِلْمِ أَحْوَالِ النَّاقِلِينَ، وَفِي مِثْلِ هَذَا يُنْتَفَعُ بِرِوَايَةِ الْمَجْهُولِ وَالسَّيِّئِ الْحِفْظِ وَبِالْحَدِيثِ الْمُرْسَلِ وَنَحْوِ ذَلِكَ؛ وَلِهَذَا كَانَ أَهْلُ الْعِلْمِ يَكْتُبُونَ مِثْلَ هَذِهِ الْأَحَادِيثِ وَيَقُولُونَ: إنَّهُ يَصْلُحُ لِلشَّوَاهِدِ وَالِاعْتِبَارِ مَا لَا يَصْلُحُ لِغَيْرِهِ؛ قَالَ أَحْمَد: "قَدْ أَكْتُبُ حَدِيثَ الرَّجُلِ لِأَعْتَبِرَهُ "، وَمَثَّلَ هَذَا بِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ لَهِيعَةَ قَاضِي مِصْرَ؛ فَإِنَّهُ كَانَ مِنْ أَكْثَرِ النَّاسِ حَدِيثًا وَمِنْ خِيَارِ النَّاسِ؛ لَكِنْ بِسَبَبِ احْتِرَاقِ كُتُبِهِ وَقَعَ فِي حَدِيثِهِ الْمُتَأَخِّرِ غَلَطٌ فَصَارَ يَعْتَبِرُ بِذَلِكَ وَيَسْتَشْهِدُ بِهِ وَكَثِيرًا مَا يَقْتَرِنُ هُوَ وَاللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ وَاللَّيْثُ حُجَّةٌ ثَبَتٌ إمَامٌ).

واتە: مەبەست ئەوەیە لێرە: ئەگەر چەند ڕێگەیەك هەبوو و ئەم کۆمەڵە هەست نەکەن ئەوانی تر چییان باسکردووە و ڕێکەوتن نەبێت لە نێوانیاندا ئەوەی گێڕدراوەتەوە زانست پێویست دەکات، بەڵام ئەمە زۆر سودی لێ دەبینرێت لە زانستی ناسینی حاڵی ئەو کەسانەی هەواڵ و فەموودە دەگێڕنەوە، هاوشێوەی ئەمە سود لە ڕیوایەتی کەسی مەجهول و ئەو کەسەی بیری خراپە (سيء الحفظ) و فەرموودەی مورسەل و هاوشێوەی ئەوانە وەردەگیرێت، لەبەر ئەوە زانایان ئەو جۆرە فەرموودانەیان دەنوسی و دەیانگوت:

(١). (شرح مقدمة أصول التفسير)(٨٥).

بۆ (شەواهید و ئیعتبار) بە كاردێت و بۆ مەبەستی تر بەكارنایەت، ئەحمەد دەڵێت: فەرموودەی كەسێك دەنوسم بۆ ئەوەی بۆ ئیعتبار بەكاری بهێنم؛ نموونەی بۆ ئەوە بە عبداللەی كوڕی لەهیعەی میصری هێنراوەتەوە، لەو كەسانە بووە زۆر فەرموودەی گێڕاوەتەوە، و لە باشترین خەڵكەكان بوو، بەڵام بەهۆی سوتانی كتێبخانەكەیەوە لە فەرموودەكانی دوای هەڵەی كردووە، ئیتر فەرموودەكانی بۆ ئیعتبار و شاهید بە كاردەهێنرێت، و زۆرجار بە هاوتای لەیسی كوڕی سەعد دادەنرێت، و لەیس (حجة ثبت إمام)ی پێدەگوترێت.

(وَكَمَا أَنَّهُمْ يَسْتَشْهِدُونَ وَيَعْتَبِرُونَ بِحَدِيثِ الَّذِي فِيهِ سُوءُ حِفْظٍ، فَإِنَّهُمْ أَيْضًا يُضَعِّفُون مِنْ حَدِيثِ الثِّقَةِ الصَّدُوقِ الضَّابِطِ أَشْيَاءَ تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ غَلِطَ فِيهَا بِأُمُورٍ يَسْتَدِلُّونَ بِهَا وَيُسَمُّونَ هَذَا "عِلْمَ عِلَلِ الْحَدِيثِ"؛ وَهُوَ مِنْ أَشْرَفِ عُلُومِهِمْ بِحَيْثُ يَكُونُ الْحَدِيثُ قَدْ رَوَاهُ ثِقَةٌ ضَابِطٌ وَغَلِطَ فِيهِ وَغَلَطُهُ فِيهِ عُرِفَ؛ إمَّا بِسَبَبٍ ظَاهِرٍ كَمَا عَرَفُوا "أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَزَوَّجَ مَيْمُونَةَ وَهُوَ حَلَالٌ، وَأَنَّهُ صَلَّى فِي الْبَيْتِ رَكْعَتَيْنِ" وَجَعَلُوا رِوَايَةَ ابْنِ عَبَّاسٍ لِتَزَوُّجِهَا حَرَامًا، وَلِكَوْنِهِ لَمْ يُصَلِّ مِمَّا وَقَعَ فِيهِ الْغَلَطُ).

واتە: وەك چۆن فەرموودەی ئەو كەسەی (سوء حفظ)ی هەیە دەیكەن بە شاهید و ئیعتبار، هەروەها چەند شتێك لە فەرموودەی كەسی سیقەی ڕاستگۆی كە لەبەركردنی زۆر وردە بە زەعیف دادەنێن بەهۆی چەند شتێكەوە بۆیان ڕوون بووەتەوە كە هەڵەی تێدا كردووە، و چەند شتێك دەكەنە بەڵگە و بەمەش دەڵێن: زانستی (علل الحديث) كەلە

بەڕێزترین زانستەکانیانە بە جۆرێك فەرموودەی کەسێکی سیقە کە لەبەرکردنی زۆر وردە و فەرموودەیەکی ڕیوایەتکردووە و هەڵەی تێدا کردووە، و هەڵەکەشی زانراوە بەهۆکارێکی ئاشکرا وەك چۆن دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ مەیمونەی خواستووە کاتێك حەڵاڵ بووە، و لە نێو کەعبەدا دوو ڕکات نوێژی کردووە، و ئەو ڕیوایەتەی ئیبن عەباس کە باس لەوە دەکات کاتێك لە ئیحرامدا بووە خواستوویەتی، و ئەوەی نوێژی نەکردووە لەو ڕیوایەتانە دایانناوە کە هەڵەی تێداکراوە.

شێخی ئیسلام مەبەستی ئەم دوو فەرموودەیەیە: مسلم لە یەزیدی کوڕی ئەصەمەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((حَدَّثَتْنِي مَيْمُونَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ تَزَوَّجَهَا وَهُوَ حَلَالٌ، قَالَ: وَكَانَتْ خَالَتِي وَخَالَةَ ابْنِ عَبَّاسٍ)).

واتە: مەیمونەی کچی حارس بۆی گێڕامەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ خواستمی حەڵاڵ بوو و لە ئیحرامدا نەبوو، مەیموونە پوری من و ئیبن عەباس بوو.

و بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَزَوَّجَ مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ مەیمونەی خواست کاتێك لە ئیحرامدابوو.

دیسان ئاماژە بۆ ئەو فەرموودەیە دەکات کە بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((دَخَلَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ البَيْتَ هو وأُسامَةُ بنُ زَيْدٍ وبِلالٌ وعُثْمانُ بنُ طَلْحَةَ فأغْلَقُوا عليهم، فَلَمّا فَتَحُوا كُنْتُ أوَّلَ مَن ولَجَ فَلَقِيتُ بلالًا فَسَأَلْتُهُ: هلْ صَلّى فيه رَسولُ اللَّهِ ﷺ ؟ قالَ: نَعَمْ بيْنَ العَمُودَيْنِ اليَمانِيَيْنِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئوسامەی کوڕی زەید و بیلال و عوسمانی کوڕی تەڵحە چوونە نێو کەعبەوە و دەرگاکەیان داخست، کاتێك دەرگاکەیان کردەوە، من یەکەم کەس بووم چوومە ژوورەوە، گەیشتمە بیلال پرسیارم لێکرد: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی تێداکرد؟ گوتی: بەڵێ، لە نێوان دوو ستونە یەمانییەکە.

بەڵام بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((لَمَّا دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ الْبَيْتَ، دَعَا فِي نَوَاحِيهِ كُلِّهَا، وَلَمْ يُصَلِّ حَتَّى خَرَجَ مِنْهُ، فَلَمَّا خَرَجَ رَكَعَ رَكْعَتَيْنِ فِي قُبُلِ الْكَعْبَةِ، وَقَالَ: هَذِهِ الْقِبْلَةُ)).

واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو کەعبەوە، لە هەموو لایەکی دوعای کرد، و نوێژی تێدا نەکرد هەتاکو دەرچوو، کاتێك دەرچوو لە پێشی کەعبە دوو ڕکات نوێژی کرد، فەرمووی: ئەمە قیبلەیە.

ئیبن عەباس نەفی ئەوەی کردووە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە نێو کەعبەدا کردبێت و ئیبن عومەر نوێژکردنی جێگیر کردووە، زانراوە ئەوەی شتێك جێگیر دەکات پێشترە لەوەی نەفی دەکات.

(وَكَذَلِكَ أَنَّهُ اعْتَمَرَ أَرْبَعَ عُمَرٍ، وَعَلِمُوا أَنَّ قَوْلَ ابْنِ عُمَرَ: "إِنَّهُ اعْتَمَرَ فِي رَجَبٍ"، مِمَّا وَقَعَ فِيهِ الْغَلَطُ؛ وَعَلِمُوا أَنَّهُ تَمَتَّعَ وَهُوَ آمِنٌ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ وَأَنَّ قَوْلَ عُثْمَانَ لِعَلِيٍّ: "كُنَّا يَوْمَئِذٍ خَائِفِينَ"مِمَّا وَقَعَ فِيهِ الْغَلَطُ؛ وَأَنَّ مَا وَقَعَ فِي بَعْضِ طُرُقِ الْبُخَارِيِّ: "أَنَّ النَّارَ لَا تَمْتَلِئُ حَتَّى يُنْشِئَ اللَّهُ لَهَا خَلْقًا آخَرَ" مِمَّا وَقَعَ فِيهِ الْغَلَطُ، وَهَذَا كَثِيرٌ، وَالنَّاسُ فِي هَذَا الْبَابِ طَرَفَانِ:).

واتە: هەروەها ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ چوار عومرەی کردووە، و دەزانن ئەو قسەیەی ئیبن عومەر کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی ڕەجەبدا عومرەی کردووە، هەڵەی تێداکراوە؛ و دەزانن حەجی تەمەتوعی کردووە لە کاتێکدا ئەمین بووە لە حەجی ماڵئاواییدا، و ئەو قسەیەی عوسمان بۆ عەلی: ئێمە لەو ڕۆژەدا دەترساین، هەڵەی تێداکراوە؛ و ئەوەی لە هەندێك ڕیوایەتی بوخاریدا هاتووە: دۆزەخ پڕ نابێت هەتاکو خوا دروستکراوی تری بۆ دروست دەکات، هەڵەی تێداکراوە، و ئەمە زۆرە، و خەڵك لەو بابەتەدا دوو لایەنن.

ئەوەی باسی عومرەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، ئاماژە بۆ ئەم فەرموودەیە دەکات، بوخاری و مسلم لە موجاهیدەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((دَخَلْتُ أَنَا وَعُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما، جَالِسٌ إِلَى حُجْرَةِ عَائِشَةَ، وَإِذَا نَاسٌ يُصَلُّونَ فِي الْمَسْجِدِ صَلَاةَ الضُّحَى، قَالَ: فَسَأَلْنَاهُ عَنْ صَلَاتِهِمْ، فَقَالَ: بِدْعَةٌ، ثُمّ قَالَ لَهُ: كَمْ اعْتَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ أَرْبَعًا: إِحْدَاهُنَّ فِي رَجَبٍ، فَكَرِهْنَا أَنْ نَرُدَّ عَلَيْهِ، قَالَ: وَسَمِعْنَا اسْتِنَانَ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ فِي الْحُجْرَةِ، فَقَالَ عُرْوَةُ: يَا أُمَّاهُ، يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ: أَلَا تَسْمَعِينَ مَا يَقُولُ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَتْ: مَا يَقُولُ؟ قَالَ: يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اعْتَمَرَ أَرْبَعَ عُمَرَاتٍ، إِحْدَاهُنَّ فِي رَجَبٍ، قَالَتْ: يَرْحَمُ اللَّهُ أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، مَا اعْتَمَرَ عُمْرَةً إِلَّا وَهُوَ شَاهِدُهُ، وما اعتمر في رجب قط)).

واتە: من و عورووەی کوڕی زوبێر ڕۆیشتین بۆ مزگەوت بینیمان ئیبن عومەر رضي الله عنهما لای ژوورەکەی عائیشە دانیشتووە، کەسانێك لە مزگەوت نوێژی چێشتەنگاویان دەکرد،

پرسیاری نوێژی ئەو کەسانەمان کرد، گوتی: بەوشێوەیە بیدعەیە!، پاشان عوروە پێیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند جار عومرەی کردووە؟ گوتی: چوار جار عومرەی کردووە یەکێکیان لە مانگی ڕەجەبدا بووە، پێمان خۆش نەبوو وەڵامی بدەینەوە، گوێمان لە دەنگی سیواککردنی عائیشەی دایکی باوەڕداران بوو، عوروە گوتی: دایکە، ئەی دایکی باوەڕداران: نابیستی باوکی عبدالرحمان چی دەڵێت؟ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چوار جار عومرەی کردووە، جارێکیان لە مانگی ڕەجەبدا بووە، گوتی: ڕەحمەتی خوا لە باوکی عبدالرحمان بێت، هیچ عومرەیەکی نەکردووە ئیللا من ئامادەی بووم، هەرگیز عومرەی لە مانگی ڕەجەبدا نەکردووە.

ئەوەی دەڵێت: (كُنَّا يَوْمَئِذٍ خَائِفِينَ"مِمَّا وَقَعَ فِيهِ الْغَلَطُ)، ئاماژە بۆ ئەم فەرموودەیە دەکات، مسلم لە عبداللەی کوڕی شەقیقەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ عُثْمَانُ يَنْهَى عَنِ الْمُتْعَةِ، وَكَانَ عَلِيٌّ يَأْمُرُ بِهَا، فَقَالَ عُثْمَانُ، لِعَلِيٍّ كَلِمَةً، ثُمَّ قَالَ: عَلِيٌّ لَقَدْ عَلِمْتَ أَنَّا قَدْ تَمَتَّعْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: أَجَلْ، وَلَكِنَّا كُنَّا خَائِفِينَ)).

واتە: ئیمامی عوسمان نەهی دەکرد حەجی تەمەتوع بکرێت، ئیمامی عەلی فەرمانی پێدەکرد، ئیمامی عوسمان قسەیەکی لەگەڵ ئیمامی عەلیدا کرد، پاشان ئیمامی عەلی گوتی: بەدڵنیاییەوە دەزانیت ئێمە حەجی تەمەتوعمان کرد لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ، ئیمامی عوسمان گوتی: بەڵێ، بەڵام لەبەر ئەوەبوو ئێمە دەترساین.

ئەوەی دەڵێت: (وَأَنَّ مَا وَقَعَ فِي بَعْضِ طُرُقِ الْبُخَارِيِّ: "أَنَّ النَّارَ لَا تَمْتَلِئُ حَتَّى يُنْشِئَ اللَّهُ لَهَا خَلْقًا آخَرَ" مِمَّا وَقَعَ فِيهِ الْغَلَطُ)، ئاماژە بۆ ئەم فەرموودەیە دەکات، بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ

دەفەرموێت: ((اخْتَصَمَتِ الجَنَّةُ والنّارُ إلى رَبِّهِما، فَقالتِ الجَنَّةُ :يا رَبِّ، ما لها لا يَدْخُلُها إلّا ضُعَفاءُ النّاسِ وسَقَطُهُمْ، وقالتِ النّارُ: - يَعْنِي - أُوثِرْتُ بالمُتَكَبِّرِينَ، فقالَ اللَّهُ تَعالى لِلْجَنَّةِ: أنْتِ رَحْمَتِي، وقالَ لِلنّارِ: أنْتِ عَذابِي، أُصِيبُ بكِ مَن أشاءُ، ولِكُلِّ واحِدَةٍ مِنْكُما مِلْؤُها، قالَ: فأمّا الجَنَّةُ، فإنَّ اللَّهَ لا يَظْلِمُ مِن خَلْقِهِ أحَدًا، وإنَّه يُنْشِئُ لِلنّارِ مَن يَشاءُ، فيُلْقَوْنَ فيها، فَتَقُولُ: هلْ مِن مَزِيدٍ، ثَلاثًا، حتّى يَضَعَ فيها قَدَمَهُ فَتَمْتَلِئُ، ويُرَدُّ بَعْضُها إلى بَعْضٍ، وتَقُولُ: قَطْ قَطْ قَطْ)).

واتە: بەهەشت و دۆزەخ سکاڵایان بردە لای پەروەردگاریان، بەهەشت گوتی: پەروەردگارە ئەوە بۆچی تەنها کەسانی لاواز و بێدەسەڵات دەچنە بەهەشتەوە، و دۆزەخ گوتی: من تایبەتکراوم بە کەسانی خۆ بەگەورەزان، خوا ﷻ بە بەهەشتی فەرموو: تۆ ڕەحمەتی منی، و بە دۆزەخی فەرموو: تۆ سزای منی، کێم بوێت بە تۆ سزای دەدەم، هەریەکە لە ئێوە پڕ دەبێت، دەفەرموێت: بەهەشت، بێگومان خوا ستەم لە هیچ کەس لە بەندەکانی ناکات، و کەسانێك بۆ دۆزەخ دروست دەکات کە بیەوێت و فڕێدەدرێنە دۆزەخەوە، دۆزەخ سێجار دەڵێت: ئایا کەسی زیاتر هەیە، هەتاکو خوا ﷻ پێی تێدەخات و پڕ دەبێت، و دێتەوە یەك، دەڵێت: بەسە بەسە بەسە.

ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەڵێت: نازانم لە هیچ فەرموودەیەکدا هاتبێت جگە لەم فەرموودەیە کە خوا ﷻ کەسانێك بۆ دۆزەخ دروست دەکات(١).

دەمامەینی دەڵێت: ((وإنَّه يُنْشِئُ لِلنّارِ مَن يَشاءُ، فيُلْقَوْنَ فيها)) هەندێك لە حافزەکان دەڵێن: ئەمە هەڵەیە و لای هەندێك ڕاوی پێچەوانە بووەتە لە بەهەشتەوە بۆ دۆزەخ، چونکە ئەو ڕاوییانەی باوەڕپێکراون باسی ئەوەیان کردووە کەسانێك بۆ بەهەشت دروست دەکات(٢).

(١). (فتح الباري)(١٣/٤٣٦).
(٢). (مصباح الجامع)(١٠/٢٢٣).

(طَرَفٌ مِنْ أَهْلِ الْكَلَامِ وَنَحْوِهِمْ مِمَّنْ هُوَ بَعِيدٌ عَنْ مَعْرِفَةِ الْحَدِيثِ وَأَهْلِهِ لَا يُمَيِّزُ بَيْنَ الصَّحِيحِ وَالضَّعِيفِ فَيَشُكُّ فِي صِحَّةِ أَحَادِيثَ أَوْ فِي الْقَطْعِ بِهَا مَعَ كَوْنِهَا مَعْلُومَةً مَقْطُوعًا بِهَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ بِهِ.

وَطَرَفٌ مِمَّنْ يَدَّعِي اتِّبَاعَ الْحَدِيثِ وَالْعَمَلِ بِهِ كُلَّمَا وَجَدَ لَفْظًا فِي حَدِيثٍ قَدْ رَوَاهُ ثِقَةٌ أَوْ رَأَى حَدِيثًا بِإِسْنَادِ ظَاهِرُهُ الصِّحَّةُ يُرِيدُ أَنْ يَجْعَلَ ذَلِكَ مِنْ جِنْسِ مَا جَزَمَ أَهْلُ الْعِلْمِ بِصِحَّتِهِ حَتَّى إذَا عَارَضَ الصَّحِيحَ الْمَعْرُوفَ أَخَذَ يَتَكَلَّفُ لَهُ التَّأْوِيلَاتِ الْبَارِدَةَ أَوْ يَجْعَلُهُ دَلِيلًا لَهُ فِي مَسَائِلِ الْعِلْمِ مَعَ أَنَّ أَهْلَ الْعِلْمِ بِالْحَدِيثِ يَعْرِفُونَ أَنَّ مِثْلَ هَذَا غَلَطٌ).

واتە: لایەنی یەکەم: ئەهلی کەلام و هاوشێوەکانیان کە دوورن لە ناسینی فەرموودە و ئەهلی فەرموودە، و جیاوازی ناکەن لە نێوان صەحیح و زەعیف، و گومان دەکەن لە صەحیحی فەرموودەکان، یان نایسەلمێنن و بە بەڵگەی دانانێن لەگەڵ ئەوەی زانراوە و سەلماوە و کراوەتە بەڵگە لای ئەوانەی زانان لەو بوارەدا.

و لایەنێکی تر: بانگەشەی ئەوە دەکەن شوێنکەوتەی فەرموودەن و ئیشی پێدەکەن، هەرکاتێك لەفزێك لە فەرموودەیەکدا ببینن کەسێکی سیقە ڕیوایەتی کردبێت، یان فەرموودەیەك ببینن ڕواڵەتەکەی صەحیح بێت دەیانەوێت ئەوە لە ڕەگەزی ئەو فەرموودانە دابنێن کە زانایان جەختیان لە صەحیحی کردووەتەوە، ئەگەر پێچەوانەی صەحیحێکی زانراویش بکات پاساوی ساردی بۆ دەهێننەوە یان دەیکەن بە بەڵگە لە چەند پرسێکی زانستیدا، لەگەڵ ئەوەی زانایانی فەرموودە دەزانن هاوشێوەی ئەوە هەڵەیە.

(وَكَمَا أَنَّ عَلَى الْحَدِيثِ أَدِلَّةً يُعْلَمُ بِهَا أَنَّهُ صِدْقٌ وَقَدْ يُقْطَعُ بِذَلِكَ فَعَلَيْهِ أَدِلَّةٌ يُعْلَمُ بِهَا أَنَّهُ كَذِبٌ وَيُقْطَعُ بِذَلِكَ؛ مِثْلُ مَا يُقْطَعُ بِكَذِبِ مَا يَرْوِيهِ الْوَضَّاعُونَ مِنْ أَهْلِ الْبِدَعِ وَالْغُلُوِّ فِي الْفَضَائِلِ: مِثْلِ حَدِيثِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ وَأَمْثَالِهِ مِمَّا فِيهِ أَنَّ مَنْ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَانَ لَهُ كَأَجْرِ كَذَا وَكَذَا نَبِيًّا).

واتە: وەك چۆن كۆمەڵە بەڵگەیەك هەیە بەهۆیەوە دەزانرێت فەرموودە ڕاستە و دەسەلمێنرێت و پشتی پێدەبەسترێت، هەروەها كۆمەڵە بەڵگەیەك هەیە بەهۆیەوە ناڕاستی دەزانرێت و دەسەلمێنرێت و پشتی پێنابەسترێت، بۆ نموونە سەلماوە ئەو شتانە درۆیە كە درۆزنەكان لە ئەهلی بیدعە و ڕۆچووەكان دەربارەی فەزڵەكان دەیگێڕنەوە، وەك فەرموودەی ڕۆژی عاشورا و هاوشێوەكانی كە تێیدا هاتووە هەركەسێك لەو ڕۆژەدا دوو ڕكات نوێژ بكات پاداشتی ئەوەندە و ئەوەندە پێغەمبەری هەیە.

(وَفِي التَّفْسِيرِ مِنْ هَذِهِ الْمَوْضُوعَاتِ قِطْعَةٌ كَبِيرَةٌ مِثْلُ الْحَدِيثِ الَّذِي يَرْوِيهِ الثَّعْلَبِيُّ وَالْوَاحِدِيُّ والزمخشري فِي فَضَائِلِ سُوَرِ الْقُرْآنِ سُورَةً سُورَةً فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ بِاتِّفَاقِ أَهْلِ الْعِلْمِ.

والثَّعْلَبِيُّ هُوَ فِي نَفْسِهِ كَانَ فِيهِ خَيْرٌ وَدِينٌ وَكَانَ حَاطِبَ لَيْلٍ يَنْقُلُ مَا وُجِدَ فِي كُتُبِ التَّفْسِيرِ مِنْ صَحِيحٍ وَضَعِيفٍ وَمَوْضُوعٍ).

واتە: لە تەفسیردا زۆر لەو شتە درۆ و هەڵبەستراوەنە هەیە نموونەی ئەو فەرموودانەی سەعلەبی و واحیدی و زەمەخشەری دەربارەی فەزڵی سورەتەكان دەیگێڕنەوە سورەت سورەت، بە كۆڕای زانایان درۆیە و هەڵبەستراوە.

سەعلەبی لە نەفسی خۆیدا پیاوێکی باش و ئایندار بوو، بەڵام باش و خراپی کۆ دەکردەوە هەموو ئەوەی لە کتێبەکانی تەفسیریدا هاتووە باسی دەکات بە صەحیح و زەعیف و مەوزوعیشەوە.

(والْوَاحِدِيُّ صَاحِبُهُ كَانَ أَبْصَرَ مِنْهُ بِالْعَرَبِيَّةِ؛ لَكِنْ هُوَ أَبْعَدُ عَنْ السَّلَامَةِ وَاتِّبَاعِ السَّلَفِ، والبغوي تَفْسِيرُهُ مُخْتَصَرٌ مِنْ الثَّعْلَبِيِّ لَكِنَّهُ صَانَ تَفْسِيرَهُ مِنْ الْأَحَادِيثِ الْمَوْضُوعَةِ وَالْآرَاءِ الْمُبْتَدَعَةِ، وَالْمَوْضُوعَاتُ فِي كُتُبِ التَّفْسِيرِ كَثِيرَةٌ مِثْلُ الْأَحَادِيثِ الْكَثِيرَةِ الصَّرِيحَةِ فِي الْجَهْرِ بِالْبَسْمَلَةِ، وَحَدِيثِ عَلِيٍّ الطَّوِيلِ فِي تَصَدُّقِهِ بِخَاتَمِهِ فِي الصَّلَاةِ فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ بِاتِّفَاقِ أَهْلِ الْعِلْمِ، وَمِثْلُ مَا رُوِيَ فِي قَوْلِهِ: ﴿وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ۝٧﴾(الرَّعْد)، أَنَّهُ عَلِيٌّ، ﴿وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ ۝١٢﴾(الحَاقَّة)، أُذُنُك يَا عَلِيٌّ).

واتە: واحیدی هاوەڵی لە عەرەبیدا لەو شارەزاتر بوو، بەڵام دووربوو لە سەلامەتی و شوێنکەوتنی سەلەف، و بەغەوی تەفسیرەکەی پوختەکراوی تەفسیری سەعلەبییە بەڵام تەفسیرەکەی پاراستووە لە فەرموودە مەوزوع و بیروڕا بیدعییە داهێنراوەکان، و ڕیوایەتە مەوزوعەکان لە کتێبەکانی تەفسیردا زۆرن، وەك ئەو فەرموودە زۆرانەی ڕاشکاوانە باسی خوێندنی (بسم الله) بە دەنگی بەرز دەکەن، و فەرموودە درێژەکەی عەلی کە باسی بەخشینی مستیلەکەی دەکات لە نوێژدا کە مەوزوعە بە ئیجماعی زانایان، و نموونەی ئەوەی ڕیوایەتکراوە دەربارەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: هەموو گەلێك بانگەوازکار و ڕێ نیشاندەرێکیان بۆ هاتووە، ڕێنماییکردوون بۆ ڕێگای ڕاست، مەبەستی

ئیمامی عەلییە رضي الله عنه، و ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: ئەو گوێیانەی دەبیستن و خاوەنەکانی بە ئاگان لەو نیعمەتەی پەروەردگاریان تێدەگەن، مەبەست گوێی تۆیە ئەی عەلی.

شێخی ئیسلام دەڵێت: فەرموودەیەکی صەحیحی ڕاشکاو جێگیر نەبووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بە دەنگی بەرز لە نوێژدا (بسم الله)ی خوێندبێت، نەلە کتێبە صەحیحەکان و نەلە سونەنەکان، ئەو فەرموودانەی ڕاشکاون هەموویان زەعیفن بەڵکو مەوزوعن، لەبەر ئەوە کاتێك دارەقوتنی کتێبێکی لەوبارەیەوە نوسی پرسیاری لێکرا: ئایا هیچ بەڵگەیەکی صەحیح لەوبارەیەوە هەیە؟ گوتی: لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەخێر، بەڵام لە هاوەڵانەوە هەندێکی صەحیحە و هەندێکی زەعیفە؛ ئەگەر بەردەوام پێغەمبەری خوا ﷺ (بسم الله) لە نوێژدا بە دەنگی بەرز خوێندبێت هاوەڵان ئەوەیان دەگێڕایەوە و خەلیفەکان ئەوەیان دەزانی و خەڵك پێویستیان بەوە نەبوو پرسیار لە ئەنەسی کوڕی مالك بکەن دوای سەردەمی خەلیفە ڕاشدییەکان[1].

---

(١). (مجموع الفتاوى)(٢٢/٢٧٥-٢٧٦).

(فَصْلٌ:

وَأَمَّا النَّوْعُ الثَّانِي مِنْ مُسْتَنَدَيْ الِاخْتِلَافِ وَهُوَ مَا يُعْلَمُ بِالِاسْتِدْلَالِ لَا بِالنَّقْلِ فَهَذَا أَكْثَرُ مَا فِيهِ الْخَطَأُ مِنْ جِهَتَيْنِ حَدَثَتَا بَعْدَ تَفْسِيرِ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَتَابِعِيهِمْ بِإِحْسَانٍ؛ فَإِنَّ التَّفَاسِيرَ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا كَلَامُ هَؤُلَاءِ صِرْفًا لَا يَكَادُ يُوجَدُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ هَاتَيْنِ الْجِهَتَيْنِ مِثْلَ تَفْسِيرِ عَبْدِ الرَّزَّاقِ وَوَكِيعٍ وَعَبْدِ بْنِ حميد وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إبْرَاهِيمَ دُحيم، وَمِثْلَ تَفْسِيرِ الْإِمَامِ أَحْمَد وَإِسْحَاقَ بْنِ راهويه وبقي بْنِ مخلد وَأَبِي بَكْرِ بْنِ الْمُنْذِرِ وَسُفْيَانَ بْنِ عيينة وَسُنَيدٍ وَابْنِ جَرِيرٍ وَابْنِ أَبِي حَاتِمٍ وَأَبِي سَعِيدٍ الْأَشَجِّ وَأَبِي عَبْدِ اللَّهِ بْنِ ماجه وَابْنِ مردويه).

واته: فەسلێك:

جۆری دووەم: لە ناكۆكییەكان ئەوەیە بەهۆی كردنە بەڵگەوە دروست دەبێت نەوەك بەهۆی ڕیوایەتەكەوە، ئەمە زیاتر هەڵەی تێدایە لە دوو ڕووەوە كە ڕوویانداوە دوای تەفسیری هاوەڵان و تابعییەكان و تابعییەكانیان بە چاكە، چونكە ئەو تەفسیرانەی بەتەنها قسەی ئەو كەسانەی تێدا بكرێت، سەختە شتێكی لەم دوو لایەنەی تێدا بێت، نموونەی تەفسیری عبدالرزاق و وەكیع و عەبدی كوڕی حومەید و عبدالرحمن كوڕی ئیبراهیم دوحەیم، و نموونەی تەفسیری ئیمام ئەحمەد و ئیسحاق كوڕی راهویە و بەقی كوڕی موخەلەد و ئەبوبەكری كوڕی مونزر و سوفیانی كوڕی عویەینە و سونەید و ئیبن جەریر و ئیبن ئەبوحاتم و ئەبو سەعیدی ئەشەج و ئەبوعبداللەی كوڕی ماجە و ئیبن مەردەویە.

(إحْدَاهُمَا: قَوْمٌ اعْتَقَدُوا مَعَانِيَ ثُمَّ أَرَادُوا حَمْلَ أَلْفَاظِ الْقُرْآنِ عَلَيْهَا.

والثَّانِيَةُ: قَوْمٌ فَسَّرُوا الْقُرْآنَ بِمُجَرَّدِ مَا يُسَوِّغُ أَنْ يُرِيدَهُ بِكَلَامِهِ مَنْ كَانَ مِنْ النَّاطِقِينَ بِلُغَةِ الْعَرَبِ مِنْ غَيْرِ نَظَرٍ إلَي الْمُتَكَلِّمِ بِالْقُرْآنِ وَالْمُنَزَّلِ عَلَيْهِ وَالْمُخَاطَبِ بِهِ.

فالْأَوَّلُونَ رَاعَوْا الْمَعْنَي الَّذِي رَأَوْهُ مِنْ غَيْرِ نَظَرٍ إلَي مَا تَسْتَحِقُّهُ أَلْفَاظُ الْقُرْآنِ مِنْ الدَّلَالَةِ وَالْبَيَانِ.

والْآخَرُونَ رَاعَوْا مُجَرَّدَ اللَّفْظِ، وَمَا يَجُوزُ عِنْدَهُمْ أَنْ يُرِيدَ بِهِ الْعَرَبِيُّ مِنْ غَيْرِ نَظَرٍ إلَي مَا يَصْلُحُ لِلْمُتَكَلِّمِ بِهِ وَلِسِيَاقِ الْكَلَامِ.

ثُمَّ هَؤُلَاءِ كَثِيرًا مَا يَغْلَطُونَ فِي احْتِمَالِ اللَّفْظِ لِذَلِكَ الْمَعْنَي فِي اللُّغَةِ كَمَا يَغْلَطُ فِي ذَلِكَ الَّذِينَ قَبْلَهُمْ، كَمَا أَنَّ الْأَوَّلِينَ كَثِيرًا مَا يَغْلَطُونَ فِي صِحَّةِ الْمَعْنَى الَّذِي فَسَّرُوا بِهِ الْقُرْآنَ كَمَا يَغْلَطُ فِي ذَلِكَ الآخرون، وَإِنْ كَانَ نَظَرُ الْأَوَّلِينَ إلَى الْمَعْنَى أَسْبَقَ وَنَظَرُ الآخرين إلَي اللَّفْظِ أَسْبَقُ).

واتە: یەکەمیان: کەسانێك باوەڕیان هێناوە کە مانای ئایەتەکە ئەوەیە پاشان ویستیان لەفزەکانی قورئان لەسەر ئەو مانایانە لێك بدەنەوە و تەفسیری بکەن.

دووەم: کەسانێك قورئانیان تەفسیرکرد بەتەنها ئەگەری ئەوەی دەشێت ئەو کەسانەی بە زمانی عەرەبی قسە دەکەن ئەگەر ئەم ڕستەیە بڵێن مەبەستیان ئەوەیە، بەبێ ئاوڕدانەوە لە مەبەستی خوای پەروەردگار کە قورئانی فەرمووە، و پێغەمبەری خوا ﷺ کە بەسەریدا دابەزیوە، و ئەو کەسەی قورئانی پێگەیەندراوە و ماناکانی بۆ باسکراوە.

کۆمەڵی یەکەم ڕەچاوی ئەو مانایەیان کردووە کە بینیویانە بەبێ تێڕوانین بۆ ئەوەی لەفزەکانی قورئان شایستەیەتی لە دەلالەت و ڕوونکردنەوە.

و ئەوانی تر تەنها ڕەچاوی لەفزیان کردووە، و ئەوەی دەشێت لای عەرەب ئەوە بێت بەبێ تێڕوانین لەوەی چی دەشێت بۆ ئەوەی فەرموویەتی و بۆ سیاقی فەرموودەکە.

پاشان ئەو کەسانە زۆرجار هەڵە دەکەن لە لێکدانەوەی لەفزێك بە ئەگەری ئەوەی مانای ئەوە بێت لە زماندا، وەك چۆن لەوەدا ئەوانەی پێشیان هەڵە دەکەن، وەك چۆن لایەنی یەکەم هەڵە دەکەن لە صەحیحی ئەو مانایەی قورئانیان پێ تەفسیرکردووە، وەك چۆن ئەوانی تر لەوەدا هەڵە دەکەن، ئەگەرچی دیدی لایەنی یەکەم بۆ ماناکە لە پێشترە، و دیدی ئەمانی تر بۆ لەفزەکە لە پێشترە.

شێخی ئیسلام بەم قسانە دەیەوێت ئەوە بگەیەنێت تەنها زانینی زمانی عەرەبی و لێکدانەوەی وشەکان بەس نییە بۆ تەفسیرکردنی قورئانی پیرۆز بەبێ ئاوڕدانەوە لە مەبەستی خوای پەروەردگار و ڕەچاوکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و لێکدانەوەی زاناکانی هاوەڵان و تابعییەکان، بۆیە ئەو کەسانەی تەفسیری قورئان دەکەن بەبێ ئەوەی پشت ببەستن بە هۆکاری دابەزین و زانستی (ناسخ و مەنسوخ) و لێکدانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئایەتەکانی و لێکدانەوەی هاوەڵان و تابعییەکان دەکەونە هەڵەی ترسناکەوە لە ڕاڤە و شیکاری مانای ئایەتەکان و تووشی تەئویلی خراپی ناو و سیفەتە جوانەکانی خوا ﷻ دەبن، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك تەفسیری ئەم ئایەتە بکات بەتەنها: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾﴾(النِّسَاء).

واتە: هەرکەسێك باوەڕدارێك بە ئەنقەست بکوژێت سزاکەی دۆزەخە بەهەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە، خوا لێی توڕەیە و نەفرەتی لێدەکات و سزایەکی زۆر گەورەی بۆ ئامادەکردووە.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: هەرکەسێك موسڵمانێك بە ئەنقەست بکوژێت بەهەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە، چونکە خوا دەفەرموێت: ﴿فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا﴾، بەڵام زۆربەی زانایان بۆچوونیان وایە کە بکوژ تەوبەی بۆ هەیە، چونکە خوا دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ٦٨ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ٦٩ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ٧٠﴾(الفُرْقَان)، دەفەرموێت: ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٥٣﴾(الزُّمَر)، دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ٤٨﴾(النِّسَاء)، بوخاری و مسلم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کەسێکی لە ئوممەتە پێشینەکان کردووە کە سەد کەسی کوشتووە پاشان تەوبەی کردووە و خوا تەوبەکەی لێوەرگرتووە؛ بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: کاتێك ئەو ئایەتە لە سورەتی (الفرقان) دابەزی کە

دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾﴾(الفُرۡقَان)، **هاوبەش** بڕیاردەرەکانی مەککە گوتیان: بێگومان ئێمە کەسانێکمان کوشتووە کە خوا حەرامی کردووە بکوژرێن، و لەگەڵ خوا شتی ترمان پەرستووە، و زیناشمان کردووە، خوا دوای ئەوە ئەمەی دابەزاند: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ ﴿٧٠﴾﴾(الفُرۡقَان)، ئەمە بۆ ئەو کەسانەیە، بەڵام ئەو ئایەتەی کە لە سورەتی النسائدایە و دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾﴾ مرۆڤ ئەگەر شارەزای شەریعەتی ئیسلام بوو پاشان خەڵکی کوشت پاداشتی دۆزەخە؛ لە ڕیوایەتی مسلمدا سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: بە ئیبن عەباسم گوت: ئایا کەسێك کەسێکی تری بە ئەنقەست کوشت تەوبەی بۆ هەیە؟ گوتی: نەخێر، ئەو ئایەتەی سورەتی (الفرقان)م بۆ خوێندەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾﴾(الفُرۡقَان)، گوتی: ئەم ئایەتە لە مەککە دابەزیوە و ئایەتێکی مەدەنی نەسخی کردووەتەوە: ﴿وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ﴾؛ دیسان بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ئەم ئایەتە لە کۆتا ئایەتەکان بوو کە دابەزی و هیچ ئایەتێکی تر نەسخی نەکردووەتەوە؛ تەبەرانی لە زەیدی کوڕی سابتەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: کاتێك ئەو ئایەتەی سورەتی (الفرقان)

دابەزی: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ٦٨﴾(الفُرۡقَان)، سەرمان سوڕما لە نەرمی ئایەتەکە، شەش مانگی بەسەردا تێپەڕی پاشان ئەو ئایەتەی سورەتی النساء دابەزی: ﴿وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ٩٣﴾؛ ئەلبانی دەڵێت: لە ڕیوایەتی بوخاریدا لە ئیبن عەباسەوە دەڵێت: ئەو کەسەی بە ئەنقەست خەڵك دەکوژێت تەوبەی بۆ نییە، ئەوەش باوە لە ئیبن عەباسەوە بکوژی ئەنقەست تەوبەی بۆ نییە، وەك ئیبن کەسیر و ئیبن حەجەر ئەوەیان باسکردووە، بەڵام جمهوری زانایان پێچەوانەی ئەوەن، ئەوەش بۆچوونی پەسەند و ڕاستە و گومانی تێدا نییە، ئەو ئایەتەی سورەتی الفرقان بەڕاشکاوی باسی ئەوە دەکات، ئایەتەکەی سورەتی النساء پێچەوانەی نییە، چونکە ئەم ئایەتە سزای بکوژەکەیە نەك باسی تەوبەکردنی، ئەوەش بە ئاشکرا دیارە، لەبەر ئەوەیە ئیبن عەباس گەڕاوەتەوە سەر ئەم بۆچوونە وەك لە هەندێك ڕیوایەتدا لە ئیبن عەباسەوە بینیومە، لەبەر ئەوەی ناوازەیە حەزدەکەم باسیان بکەم، یەکەم: بوخاری لە (الأدب المفرد)دا بە صەحیحی لە عەتای کوڕی یەسارەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پیاوێك هات بۆ لای ئیبن عەباس پێی گوت: من خوازبێنی ئافرەتێکم کرد، بەڵام ڕازی نەبوو هاوسەرگیریم لەگەڵ بکات، کەسێکی تر چووە خوازبێنی، ئافرەتەکە حەزی کرد هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، غیرەتم کرد و پێم ناخۆش بوو بۆیە ئافرەتەکەم کوشت، ئایا تەوبە و پەشیمان بوونەوەم بۆ هەیە؟ ئیبن عەباس گوتی: ئایا دایکت لە ژیاندا ماوە؟ گوتی: نەخێر، گوتی: تەوبە

بکە و بگەڕێرەوە بۆ لای خوا و نزیك بەرەوە لێی ئەوەندەی دەتوانیت، عەتا دەڵێت: پرسیارم لە ئیبن عەباس کرد: بۆچی پرسیاری ئەوەت لێکرد کە دایکی لە ژیاندا ماوە؟ گوتی: هیچ کردەوەیەك نازانم مرۆڤ نزیك بکاتەوە لە خوا وەك چاکەکردن لەگەڵ دایك؛ دووەم: ئەوەی کە سەعید لە ئیبن عەباسی گێڕاوەتەوە کە لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا: ﴿وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا ٩٣﴾، دەڵێت: بکوژ تەوبەی بۆ نییە مەگەر داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات، تەبەری گێڕاویەتییەوە بە سەنەدێکی صەحیح، وەك ئەوەی بڵێت: لێخۆش بوونی بۆ نییە، پاشان ئەوەی بۆ خۆی ڕاستکردەوە، گوتی: مەگەر ئەوەی خوا لێی ببورێت[1].

(وَالْأَوَّلُونَ صِنْفَانِ: تَارَةً يَسْلُبُونَ لَفْظَ الْقُرْآنِ مَا دَلَّ عَلَيْهِ وَأُرِيدَ بِهِ، وَتَارَةً يَحْمِلُونَهُ عَلَى مَا لَمْ يَدُلَّ عَلَيْهِ وَلَمْ يُرَدْ بِهِ.

وَفِي كَلَا الْأَمْرَيْنِ قَدْ يَكُونُ مَا قَصَدُوا نَفْيَهُ أَوْ إِثْبَاتَهُ مِنْ الْمَعْنَى بَاطِلًا فَيَكُونُ خَطَؤُهُمْ فِي الدَّلِيلِ وَالْمَدْلُولِ، وَقَدْ يَكُونُ حَقًّا فَيَكُونُ خَطَؤُهُمْ فِي الدَّلِيلِ لَا فِي الْمَدْلُولِ).

واتە: لایەنی یەکەم دوو جۆرن: جارێك ئەو مانایەی لەفزی قورئان دەیخوازێت و مەبەستییەتی لێی دادەڕنن، و جارێك لێکدانەوەیەکی بۆ دەکەن کە ئەو مانایە هەڵناگرێت و مەبەستی نییە.

(١). (الصحيحة)(٦/٧١١).

و له هەردوو بارەكەدا لەوانەیە ئەو مانایەی ویستویانە نەفی بکەن یان جێگیری بکەن باتڵ بێت، هەڵەکەشیان لە بەڵگەکە و ئەوەی کردوویانەتە بەڵگە لەسەری، و لەوانەیە حەق بێت ئەو کاتە هەڵەکەیان لە بەڵگەکەدایە نەوەك ماناکەی و ئەوەی کردوویانەتە بەڵگە لەسەری.

(وَهَذَا كَمَا أَنَّهُ وَقَعَ فِي تَفْسِيرِ الْقُرْآنِ فَإِنَّهُ وَقَعَ أَيْضًا فِي تَفْسِيرِ الْحَدِيثِ؛ فَالَّذِينَ أَخْطَئُوا فِي الدَّلِيلِ وَالْمَدْلُولِ - مِثْلُ طَوَائِفَ مِنْ أَهْلِ الْبِدَعِ - اعْتَقَدُوا مَذْهَبًا يُخَالِفُ الْحَقَّ الَّذِي عَلَيْهِ الْأُمَّةُ الْوَسَطُ الَّذِينَ لَا يَجْتَمِعُونَ عَلَى ضَلَالَةٍ كَسَلَفِ الْأُمَّةِ وَأَئِمَّتِهَا وَعَمَدُوا إلَي الْقُرْآنِ فَتَأَوَّلُوهُ عَلَى آرَائِهِمْ؛ تَارَةً يَسْتَدِلُّونَ بِآيَاتِ عَلَي مَذْهَبِهِمْ وَلَا دَلَالَةَ فِيهَا، وَتَارَةً يَتَأَوَّلُونَ مَا يُخَالِفُ مَذْهَبَهُمْ بِمَا يُحَرِّفُونَ بِهِ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ، وَمِنْ هَؤُلَاءِ فِرَقُ الْخَوَارِجِ وَالرَّوَافِضِ والجهمية وَالْمُعْتَزِلَةِ وَالْقَدَرِيَّةِ وَالْمُرْجِئَةِ وَغَيْرِهِمْ).

واتە: ئەمە وەك چۆن لە تەفسیری قورئاندا ڕوویداوە دیسان لە تەفسیر و لێکدانەوەی فەرموودەشدا ڕوویداوە، ئەوانەی لە بەڵگە و مانا و لێکدانەوەی بەڵگەشدا کەوتنە هەڵەوە –وەك کۆمەڵانی ئەهلی بیدع– بیروباوەڕیان بە مەزهەبێکی پێچەوانەی حەق هەیە کە ئوممەتی مامناوەندی دادگەری لەسەرە و لەسەر گومڕایی کۆنابنەوە وەك سەلەفی ئوممەت و پێشەواکانی، ئەو کۆمەڵانە قورئانیان بە ڕەئی خۆیان لێکدایەوە، جارێك کۆمەڵێك ئایەت دەکەنە بەڵگە لەسەر مەزهەبەکەیان کە بەڵگەی تێدا نییە بۆیان، و جارێك لێکدانەوەی هەڵە دەکەن بۆ ئەو بەڵگانەی پێچەوانەی مەزهەبەکەیانە مانا و

مەبەستی وشەکان تێکدەدەن، خەوارجەکان و ڕافیزەکان و جەهمییە و موعتەزیلە و قەدەرییە و مورجئە و جگە لەوانیش لەو کۆمەڵانەن.

مەبەستی شێخی ئیسلام ئەوەیە ئەوانەی لاڕێ و موبتەدیعن بەڵگەکانی قورئان و سوننەت بە دوو مەبەست بۆ خزمەتی بیروباوەڕی و ڕێبازی خۆیان بەکاردەهێنن، یان هەوڵی گونجاندنی بەڵگەکانی قورئان و سوننەت دەدەن بۆ ئەوەی بیخەنە خزمەتی بیروباوەڕەکەیانەوە، یان لێکدانەوە و تەفسیری هەڵەی بۆ دەکەن بۆ ئەوەی بیگونجێنن و پێچەوانەی بیروباوەڕەکەیان نەبێت و بەشێوەیەك دەیکەنە بەڵگە بەهیچ شێوەیەك بەڵگەی تێدا نییە لەسەر بیروباوەڕەکەیان.

(وَهَذَا كَالْمُعْتَزِلَةِ مَثَلًا فَإِنَّهُمْ مِنْ أَعْظَمِ النَّاسِ كَلَامًا وَجِدَالًا، وَقَدْ صَنَّفُوا تَفَاسِيرَ عَلَي أُصُولِ مَذْهَبِهِمْ؛ مِثْلِ تَفْسِيرِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كيسان الْأَصَمِّ شَيْخِ إبْرَاهِيمَ بْنِ إسْمَاعِيلَ بْنِ عُلَيَّةَ الَّذِي كَانَ يُنَاظِرُ الشَّافِعِيَّ؛ وَمِثْلِ كِتَابِ أَبِي عَلِيٍّ الجبائي، وَالتَّفْسِيرِ الْكَبِيرِ لِلْقَاضِي عَبْدِ الْجَبَّارِ بْنِ أَحْمَدَ الهمداني، وَلِعَلِيِّ بْنِ عِيسَي الرُّمَّانِيِّ، وَالْكَشَّافِ لِأَبِي الْقَاسِمِ الزمخشري؛ فَهَؤُلَاءِ وَأَمْثَالُهُمْ اعْتَقَدُوا مَذَاهِبَ الْمُعْتَزِلَةِ.
وَأُصُولُ الْمُعْتَزِلَةِ خَمْسَةٌ يُسَمُّونَهَا هُمْ: التَّوْحِيدُ وَالْعَدْلُ وَالْمَنْزِلَةُ بَيْنَ الْمَنْزِلَتَيْنِ وَإِنْفَاذُ الْوَعِيدِ وَالْأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنْ الْمُنْكَرِ).

واتە: بۆ نموونە موعتەزیلەکان لە هەموو خەڵك زیاتر قسە دەکەن و مشتومڕ دەکەن، و تەفسیریان نوسیوەتەوە لەسەر بنەمای مەزهەبەکەیان، وەك تەفسیری عبدالرحمانی کوڕی کەیسانی ئەصەم شێخی ئیبراهیمی کوڕی ئیسماعیل کوڕی عولەییە کە

چەندوچوونی لەگەڵ شافعیدا دەکرد، و نموونەی کتێبەکەی ئەبوعەلی جوبائی، و تەفسیری (الکبیر) قازی عبدالجباری کوڕی ئەحمەدی هەمەدانی و عەلی کوڕی عیسای ڕومانی، و (الکشاف) ئەبوقاسمی زەمەخشەری، ئەوانە و هاوشێوەکانیان بیروباوەڕیان بە مەزهەبەکانی موعتەزیلە هەیە.

و بنەماکانی موعتەزیلە پێنج بنەمایە کە بریتین لە: تەوحید، دادگەری، پلەیەك لە نێوان دوو پلەدا، و جێبەجێبوونی هەڕەشە، و فەرمانکردن بە چاکە و یاساغی خراپە.

(وتَوْحِيدُهُمْ هُوَ تَوْحِيدُ الجهمية الَّذِي مَضْمُونُهُ نَفْيُ الصِّفَاتِ وَغَيْرُ ذَلِكَ قَالُوا: إنَّ اللَّهَ لَا يُرَي، وَإِنَّ الْقُرْآنَ مَخْلُوقٌ، وَإِنَّهُ لَيْسَ فَوْقَ الْعَالَمِ، وَإِنَّهُ لَا يَقُومُ بِهِ عِلْمٌ وَلَا قُدْرَةٌ، وَلَا حَيَاةٌ، وَلَا سَمْعٌ، وَلَا بَصَرٌ، وَلَا كَلَامٌ وَلَا مَشِيئَةٌ وَلَا صِفَةٌ مِنْ الصِّفَاتِ.

وَأَمَّا عَدْلُهُمْ فَمِنْ مَضْمُونِهِ أَنَّ اللَّهَ لَمْ يَشَأْ جَمِيعَ الْكَائِنَاتِ وَلَا خَلَقَهَا كُلَّهَا وَلَا هُوَ قَادِرٌ عَلَيْهَا كُلِّهَا؛ بَلْ عِنْدَهُمْ أَنَّ أَفْعَالَ الْعِبَادِ لَمْ يَخْلُقْهَا اللَّهُ، لَا خَيْرَهَا وَلَا شَرَّهَا، وَلَمْ يُرِدْ إلَّا مَا أَمَرَ بِهِ شَرْعًا وَمَا سِوَي ذَلِكَ فَإِنَّهُ يَكُونُ بِغَيْرِ مَشِيئَتِهِ).

واتە: تەوحیدەکەیان بریتییە لە تەوحیدی جەهمییەکان کە نەفی سیفەتەکانی خوا و جگە لەوەش لەخۆ دەگرێت و دەڵێن: خوا نابینرێت، و قورئان دروستکراوە، و خوا لەسەرووی دروستکراوەکانییەوە نییە، و زانست و توانا و ژیان و بیستن و بینین و قسە و ویست هیچ سیفەتێکی نییە.

و دادگەرییەکەیان مەبەستیان ئەوەیە خوا هەموو شتێکی نەویستووە و دروستی نەکردووە و توانای نییە بەسەر هەموویاندا، بەڵکو کردەوەی بەندەکان لای ئەوان

دروستکراوی خوا نییە، نەباش و نەخراپی، و خوا تەنها ئەوەی ویستووە کەلە شەرعدا فەرمانی پێکردووە، جگە لەوە ئەوەی ڕوودەدات بەبێ ویستی خوا ڕوودەدات!.

بنەمای سێیەمیان: پلەیەکە لە نێوان دوو پلەدا مەبەستیان ئەوەیە، کەسێکی باوەڕدار کە تاوانی گەورەی ئەنجامدابێت و تەوبەی لێنەکردبێت، نەباوەڕدارە و نەبێباوەڕە، بەڵکو لە پلەیەکی نێوان ئەو دوو پلە دایە.

بنەمای چوارەمیان: جێبەجێبوونی هەڕەشەکانە، مەبەستیان ئەو ئایەت و فەرموودانەی هەڕەشەی چوونە دۆزەخی کردووە لەسەر هەندێك تاوان جێبەجێ دەبێت، بۆ نموونە ئەو ئایەتەی خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾﴾(النِّسَاء).

واتە: هەرکەسێك باوەڕدارێك بە ئەنقەست بکوژێت سزاکەی دۆزەخە بەهەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە، خوا لێی توڕەیە و نەفرەتی لێدەکات و سزایەکی زۆر گەورەی بۆ ئامادەکردووە.

دەڵێن: ئەمە هەڕەشەیە لە بکوژ و ئەو هەڕەشەیە جێبەجێ دەبێت و بکوژ بەهەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە، پێشتر بە درێژی باسی ئەم ئایەتەکراوە.

و بۆ نموونەی ئەو فەرموودەیەی نەسائی و ئیبن خوزەیمە لە (التوحيد) لە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری

خوا ﷺ دەفەرمویت: ((ثلاثةٌ لا يَدخُلونَ الجَنَّةَ: العاقُّ لوالديهِ، والدَّيُّوثُ، والرَّجِلةُ من النِّساءِ)).

واتە: سێ کەس ناچنە بەهەشتەوە: ئەو کەسەی خراپەکارە لەگەڵ دایك و باوکی، و دەیوس، ئەو پیاوانەی خۆیان دەچوێنن بە ئافرەتان.

بنەمای پێنجەم: فەرمانکردن بە چاکە و نەهیکردن لە خراپەیە، دەڵێن: پێویستە فەرمان بە جگە لە خۆمان بکەین بەوەی فەرمانمان پێکراوە و پەیوەستیان بکەین، ئەمە فەرمان بە چاکەیە، و نەهی لە خراپە یاساغی و ڕێگریکردنی خراپە و لەو خراپانەش کە دەبێت ڕێگیری بکرێت چەك هەڵگرتن و شمشێر هەڵکێشانە لە کاربەدەستان ئەگەر ستەمیان کرد.

(وَقَدْ وَافَقَهُمْ عَلَى ذَلِكَ مُتَأَخِّرُو الشِّيعَةِ كَالْمُفِيدِ وَأَبِي جَعْفَرٍ الطوسي وَأَمْثَالِهِمَا، وَلِأَبِي جَعْفَرٍ هَذَا تَفْسِيرٌ عَلَي هَذِهِ الطَّرِيقَةِ؛ لَكِنْ يُضَمُّ إلَي ذَلِكَ قَوْلُ الْإِمَامِيَّةِ الِاثْنَيْ عَشَرِيَّةَ؛ فَإِنَّ الْمُعْتَزِلَةَ لَيْسَ فِيهِمْ مَنْ يَقُولُ بِذَلِكَ وَلَا مَنْ يُنْكِرُ خِلَافَةَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ وَعَلِيٍّ).

واتە: لەوەشدا شیعەکانی ئەم دواییە هاوڕایانن وەك موفید و ئەبوجەعفەری توسی و هاوشێوەکانیان، ئەم ئەبوجەعفەرە تەفسیرێکی هەیە لەسەر ئەو ڕێبازە، بەڵام بۆچوونی دوازدە ئیمامییەکانی بۆ زیاد دەکات، چونکە کەس لە موعتەزیلە نییە نکۆڵی خەلافەتی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی بکات.

شێخی ئیسلام دەڵێت: شیعەکانی سەرەتا ناکۆك نەبوون لە پێشەوایەتی و فەزڵی ئەبوبەکر و عومەر، بەڵکو ناکۆکبوون دەربارەی عەلی و عوسمان، بۆیە شەریکی کوڕی عبدالله دەڵێت: باشترین کەس دوای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکر و عومەرە، پێیانگوت وا دەڵێیت: لە کاتێکدا تۆ شیعەیت؟ گوتی: ئەوە بۆچوونی هەموو شیعەیە[1].

(وَمِنْ أُصُولِ الْمُعْتَزِلَةِ مَعَ الْخَوَارِجِ إنْفَاذُ الْوَعِيدِ فِي الْآخِرَةِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَقْبَلُ فِي أَهْلِ الْكَبَائِرِ شَفَاعَةً وَلَا يُخْرِجُ مِنْهُمْ أَحَدًا مِنْ النَّارِ.

وَلَا رَيْبَ أَنَّهُ قَدْ رَدَّ عَلَيْهِمْ طَوَائِفُ مِنْ الْمُرْجِئَةِ والكرامية والكلابية وَأَتْبَاعِهِمْ؛ فَأَحْسَنُوا تَارَةً وَأَسَاءُوا أُخْرَى حَتَّى صَارُوا فِي طَرَفَيْ نَقِيضٍ كَمَا قَدْ بُسِطَ فِي غَيْرِ هَذَا الْمَوْضِعِ.

وَالْمَقْصُودُ أَنَّ مِثْلَ هَؤُلَاءِ اعْتَقَدُوا رَأْيًا ثُمَّ حَمَلُوا أَلْفَاظَ الْقُرْآنِ عَلَيْهِ وَلَيْسَ لَهُمْ سَلَفٌ مِنْ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ لَهُمْ بِإِحْسَانِ وَلَا مِنْ أَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ لَا فِي رَأْيِهِمْ وَلَا فِي تَفْسِيرِهِمْ).

واتە: هەروەها لە بنەماکانی موعتەزیلە بەجێهێنانی هەڕەشەیە لە قیامەتدا، خوا ﷻ شەفاعەت بۆ خاوەن تاوانە گەورەکان قەبوڵ ناکات و کەسیان لە ئاگری دۆزەخ دەرناچن.

بێگومان کۆمەڵانێك لە مورجیئە و کەرامییە و کولابییە و شوێنکەوتووەکانیان وەڵامیان داونەتەوە، جارێك باشیان کردووە و جارێك خراپ، هەتاکو کەوتوونەتە دوو بەرەی دژیەکەوە، لە شوێنی تر بە درێژی باسکراوە.

(١). (مجموع الفتاوى)(٣٤/١٣).

مەبەست ئەوەیە بیروباوەڕیان بە بۆچوونێك هێناوە پاشان لەفزی قورئانیان لەسەر ئەوە لێکداوەتەوە، و سەلەفیان لە هاوەڵان و تابعییەکان و شوێنکەوتە باشەکانیان و پێشەواکانی موسڵمانان نییە، نەلە بیروبۆچوون و ڕەئییان و نەلە تەفسیرکردنیان بەوشێوەیە بۆ قورئان.

یەکێکی تر لە بنەماکانی موعتەزیلە و خەواریجەکان ئەوەیە باوەڕیان بە شەفاعەت نییە، و دەڵێن: هەرکەسێك خراپە دۆزەخەوە بەهەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە، مسلم لە یەزیدی فەقیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كُنْتُ قَدْ شَغَفَنِي رَأْيٌ مِن رَأْيِ الخَوارِجِ، فَخَرَجْنا في عِصابَةٍ ذَوِي عَدَدٍ نُرِيدُ أنْ نَحُجَّ، ثُمَّ نَخْرُجَ على النّاسِ، قالَ: فَمَرَرْنا على المَدِينَةِ، فإذا جابِرُ بنُ عبدِ اللهِ يُحَدِّثُ القَوْمَ، جالِسٌ إلى سارِيَةٍ، عن رَسولِ اللهِ ﷺ قالَ: فإذا هو قدْ ذَكَرَ الجَهَنَّمِيِّينَ، قالَ: فَقُلْتُ له: يا صاحِبَ رَسولِ اللهِ، ما هذا الذي تُحَدِّثُونَ؟ واللَّهُ يقولُ: ﴿إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ﴾(آلِ عِمْرَان) و ﴿كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخْرُجُواْ مِنْهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا ﴿٢٠﴾﴾(السَّجْدَة)، فَما هذا الذي تَقُولونَ؟ قالَ: فقالَ: أتَقْرَأُ القُرْآنَ؟ قُلتُ: نَعَمْ، قالَ: فَهلْ سَمِعْتَ بمَقامِ مُحَمَّدٍ عليه السَّلامُ، يَعْنِي الذي يَبْعَثُهُ اللَّهُ فِيهِ؟ قُلتُ: نَعَمْ، قالَ: فإنَّه مَقامُ مُحَمَّدٍ ﷺ المَحْمُودُ الذي يُخْرِجُ اللَّهُ به مَن يُخْرِجُ)).

واتە: من بۆچوونێکی خەوارجەکان چووبووە دڵمەوە لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر دەرچووین ویستمان حەج بکەین پاشان بدەین بەسەر خەڵکدا، لەپێشدا چووینە مەدینە و بینیمان جابری کوڕی عبدالله پشتی بە پایەیەکەوە داوە و فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ

خەڵك دەگێڕێتەوە، باسی دۆزەخییەکانی کرد، گوتم: ئەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ئەوە چی دەگێڕیتەوە و چی دەڵێیت لە کاتێکدا خوا فەرموویەتی: پەروەردگارمان تۆ هەرکەس بخەیتە ئاگری دۆزەخەوە بێگومان ڕیسوا و زەبوونت کردووە، و دەفەرموێت: هەرکاتێك هەوڵبدەن و بیانەوێت لێی دەربچن دەیانگەڕێننەوە بۆ دۆزەخ، جابر گوتی: قورئان دەخوێنیتەوە؟! گوتم: بەڵێ، گوتی: ئایە پلەوپایەی محمدت ﷺ بیستووە؟! گوتم: بەڵێ، (مقام المحمودة)، گوتی: بەهۆی پلەوپایە و شەفاعەتی محمدەوە ﷺ لە ئاگر دەردەکرێت هەرکەسێك خوا بیەوێت دەرییبکات.

(وَمَا مِنْ تَفْسِيرٍ مِنْ تَفَاسِيرِهِمْ الْبَاطِلَةِ إلَّا وَبُطْلَانُهُ يَظْهَرُ مِنْ وُجُوهٍ كَثِيرَةٍ وَذَلِكَ مِنْ جِهَتَيْنِ: تَارَةً مِنْ الْعِلْمِ بِفَسَادِ قَوْلِهِمْ، وَتَارَةً مِنْ الْعِلْمِ بِفَسَادِ مَا فَسَّرُوا بِهِ الْقُرْآنَ، إمَّا دَلِيلًا عَلَى قَوْلِهِمْ، أَوْ جَوَابًا عَلَي الْمُعَارِضِ لَهُمْ.

وَمِنْ هَؤُلَاءِ مَنْ يَكُونُ حَسَنَ الْعِبَارَةِ فَصِيحًا وَيَدُسُّ الْبِدَعَ فِي كَلَامِهِ، وَأَكْثَرُ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ كَصَاحِبِ الْكَشَّافِ وَنَحْوِهِ، حَتّى إنَّهُ يُرَوِّجُ عَلَي خَلْقٍ كَثِيرٍ مِمَّنْ لَا يَعْتَقِدُ الْبَاطِلَ مِنْ تَفَاسِيرِهِمْ الْبَاطِلَةِ مَا شَاءَ اللَّهُ.

وَقَدْ رَأَيْت مِنْ الْعُلَمَاءِ الْمُفَسِّرِينَ وَغَيْرِهِمْ مَنْ يَذْكُرُ فِي كِتَابِهِ وَكَلَامِهِ مِنْ تَفْسِيرِهِمْ مَا يُوَافِقُ أُصُولَهُمْ الَّتِي يَعْلَمُ أَوْ يَعْتَقِدُ فَسَادَهَا وَلَا يَهْتَدِي لِذَلِكَ).

واتە: هیچ تەفسیرێك نییە لە تەفسیرە باتڵەکانیان ئیللا باتڵی و پووچەڵی لە زۆر ڕووەوە دەردەکەوێت، ئەوەش لە دوو ڕوانگەوە: جارێك لە ڕوانگەی زانستییەوە دەزانرێت بۆچوونەکەیان خراپە، و جارێك لەبەر خراپی ئەوەی تەفسیری قورئانیان

پێکردووە، یان بە بەڵگە هێنانەوە لەسەر بۆچوونەکەیان، یان وەڵامدانەوەی کەسێك کە پێچەوانەیانە.

و لەو کەسانە هەیانە قسە و دەربڕینی جوان و پاراوە بیدعە دەخاتە نێو قسەکانییەوە، زۆربەی خەڵك ئەوە نازانن وەك خاوەنی (الکشاف) و هاوشێوەی ئەو، هەتاکو بەسەر زۆر خەڵکدا تەفسیرە خراپەکانیان تێدەپەڕێت بە ویستی خوا کە خۆی ئەو بیروباوەڕە باتڵەی نییە.

(ثُمَّ إنَّهُ لِسَبَبِ تَطَرُّفِ هَؤُلَاءِ وَضَلَالِهِمْ دَخَلَتْ الرَّافِضَةُ الْإِمَامِيَّةُ ثُمَّ الْفَلَاسِفَةُ ثُمَّ الْقَرَامِطَةُ وَغَيْرُهُمْ فِيمَا هُوَ أَبْلَغُ مِنْ ذَلِكَ وَتَفَاقَمَ الْأَمْرِ فِي الْفَلَاسِفَةِ وَالْقَرَامِطَةِ وَالرَّافِضَةِ، فَإِنَّهُمْ فَسَّرُوا الْقُرْآنَ بِأَنْوَاعِ لَا يَقْضِي الْعَالِمُ مِنْهَا عَجَبَهُ).

واتە: پاشان هۆکاری پەڕگیری ئەو کەسانە و گومڕاییان تووشی ڕافیزە ئیمامییەکان پاشان فەیلەسوفەکان پاشان قەڕامیتە و هاوشێوەکانیان بوو، و فەیلەسوف و قەڕامیتە و ڕافیزە لەو گومڕاییانە زیاتر ڕۆچوون و حاڵیان خراپتربوو، قورئانیان تەفسیرکرد بە چەند جۆرە بۆچوونێك کە خەڵك سەرسوڕمانیان کۆتایی نایەت لە شتە سەیرەکانیان.

(فَتَفْسِيرُ الرَّافِضَةِ كَقَوْلِهِمْ: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١﴾(المَسَد)، هُمَا أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، و﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾(الزُّمَر)، أَيْ: بَيْنَ أَبِي بَكْرٍ وَعَلِيٍّ فِي الْخِلَافَةِ، و﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُواْ بَقَرَةً ۝٦٧﴾(البَقَرَة)، هِيَ عَائِشَةُ، و﴿فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلْكُفْرِ ۝١٢﴾(التَّوبَة)، طَلْحَةَ وَالزُّبَيْرَ، و﴿مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ ۝١٩﴾(الرَّحمَن)، عَلِيٌّ وَفَاطِمَةُ،

و﴿ٱللُّؤۡلُؤُ وَٱلۡمَرۡجَانُ ٢٢﴾(الرَّحۡمَٰن)، الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ، و﴿وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ ١٢﴾(يسٓ)، فِي عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، و﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ١ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ ٢﴾(النَّبَإِ)، عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، و﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمۡ رَٰكِعُونَ ٥٥﴾(المَائِدَة)، هُوَ عَلِيٌّ وَيَذْكُرُونَ الْحَدِيثَ الْمَوْضُوعَ بِإِجْمَاعِ أَهْلِ الْعِلْمِ وَهُوَ تَصَدُّقُهُ بِخَاتَمِهِ فِي الصَّلَاةِ، وَكَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ ١٥٧﴾(البَقَرَة)، نَزَلَتْ فِي عَلِيٍّ لَمَّا أُصِيبَ بِحَمْزَةِ).

واتە: تەفسیر ڕافیزەکان کە دەڵێن: ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١﴾، بریتییە لە ئەبوبەکر و عومەر، و ﴿لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾، واتە: لە نێوان ئەبوبەکر و عەلی لەسەر خیلافەت، و ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تَذۡبَحُواْ بَقَرَةٗۖ ٦٧﴾ ئەوە عائیشەیە، و ﴿فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ ١٢﴾ تەڵحە و زوبێرە، و ﴿مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ ١٩﴾ عەلی و فاتیمەیە، و ﴿ٱللُّؤۡلُؤُ وَٱلۡمَرۡجَانُ ٢٢﴾ حەسەن و حوسەینە، و ﴿وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ ١٢﴾ مەبەست عەلی کوڕی ئەبوتالبە، و ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ١ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ ٢﴾ عەلی کوڕی ئەبوتالبە، و ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمۡ رَٰكِعُونَ ٥٥﴾ بریتییە لە عەلی کە مستیلەکەی لە نوێژدا بەخشیوە و باسی فەرموودەیەك دەکەن بە ئیجماعی زانایان مەوزوعە، هەروەها ئەوەی دەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ ١٥٧﴾ دەربارەی عەلی دابەزیوە کاتێك حەمزە کوژراوە.

(وَمِمَّا يُقَارِبُ هَذَا مِنْ بَعْضِ الْوُجُوهِ مَا يَذْكُرُهُ كَثِيرٌ مِنَ الْمُفَسِّرِينَ فِي مِثْلِ قَوْلِهِ: ﴿ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ١٧﴾(آلِ عِمْرَان)، أَنَّ ﴿ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ رَسُولُ اللَّهِ، ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ﴾ أَبُو بَكْرٍ، ﴿وَٱلْقَٰنِتِينَ﴾ عُمَرُ، ﴿وَٱلْمُنفِقِينَ﴾ عُثْمَانُ، ﴿وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ﴾ عَلِيٌّ.

وَفِي مِثْلِ قَوْلِهِ: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾ أَبُو بَكْرٍ، ﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ﴾ عُمَرُ، ﴿رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ﴾ عُثْمَانُ، ﴿تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا ٢٩﴾(الفَتْح) عَلِيٌّ.

وَأَعْجَبُ مِنْ ذَلِكَ قَوْلُ بَعْضِهِمْ: ﴿وَٱلتِّينِ﴾ أَبُو بَكْرٍ، ﴿وَٱلزَّيْتُونِ﴾ عُمَرُ، ﴿وَطُورِ سِينِينَ ٢﴾ عُثْمَانُ، ﴿وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ٣﴾(التِّين) عَلِيٌّ.

وَأَمْثَالُ هَذِهِ الْخُرَافَاتِ الَّتِي تَتَضَمَّنُ تَارَةً تَفْسِيرَ اللَّفْظِ بِمَا لَا يَدُلُّ عَلَيْهِ بِحَالٍ، فَإِنَّ هَذِهِ الْأَلْفَاظَ لَا تَدُلُّ عَلَى هَؤُلَاءِ الْأَشْخَاصِ.

وقوله تعالى: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا ٢٩﴾(الفَتْح) كُلُّ ذَلِكَ نَعْتٌ لِلَّذِينَ مَعَهُ وَهِيَ الَّتِي يُسَمِّيهَا النُّحَاةُ خَبَرًا بَعْدَ خَبَرٍ؛ والْمَقْصُودُ هُنَا: أَنَّهَا كُلَّهَا صِفَاتٌ لِمَوْصُوفٍ وَاحِدٍ وَهُمْ الَّذِينَ مَعَهُ، وَلَا يَجُوزُ أَنْ يَكُونَ كُلٌّ مِنْهَا مُرَادًا بِهِ شَخْصٌ وَاحِدٌ.

وَتَتَضَمَّنُ تَارَةً جَعْلَ اللَّفْظِ الْمُطْلَقِ الْعَامِّ مُنْحَصِرًا فِي شَخْصٍ وَاحِدٍ، كَقَوْلِهِ إِنَّ قَوْلَهُ: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾(المَائِدَة) أُرِيدَ بِهَا عَلِيٌّ وَحْدَهُ.

وَقَوْلِ بَعْضِهِمْ، أَنَّ قَوْلَهُ: ﴿وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ٣٣﴾(الزُّمَر)، أُرِيدَ بِهَا أَبُو بَكْرٍ وَحْدَهُ، وَقَوْلِهِ: ﴿لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ ۚ ١٠﴾(الحَدِيد)، أُرِيدَ بِهَا أَبُو بَكْرٍ وَحْدَهُ، وَنَحْوِ ذَلِكَ).

واتە: ئەو تەفسیرانەی کەلە هەندێك ڕووەوە لەمەوە نزیکە و زۆرێك لە ڕاڤەکاران باسی دەکەن دەربارەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ﴿١٧﴾﴾ ئارامگران پێغەمبەری خوایە، و ڕاستگۆیان ئەبوبەکرە، و گوێڕایەڵان عومەرە، بەخشندەکان عوسمان، و تۆبەکاران عەلییە.

و نموونەی ئەو ئایەتەی: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ﴾ ئەبوبەکرە، ﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ﴾ عومەرە، ﴿رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ﴾ عوسمانە، ﴿تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا ﴿٢٩﴾﴾ عەلییە.

لەوە سەرسوڕهێنەرتر قسەی ئەوانەیانە کە دەڵێن: ﴿وَٱلتِّينِ﴾ ئەبوبەکرە، ﴿وَٱلزَّيْتُونِ﴾ عومەرە، ﴿وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾﴾ عوسمانە، ﴿وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ﴿٣﴾﴾ عەلییە.

و هاوشێوەی ئەم لێکدانەوە پڕوپووچانە کە هەندێك جار تەفسیرکردنی لەفزەکەیە کە بەهیچ شێوەیەك لەفزەکە بەڵگە نییە لەسەری، چونکە بێگومان ئەو لەفزانە بەڵگە نین لەسەر ئەو کەسانە.

و ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا ﴿٢٩﴾﴾ هەموو ئەوە سیفەتە بۆ ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بوون، کە نەحوییەکان پێی دەڵێن: خەبەر دوای خەبەر، مەبەست لێرە: هەموو ئەو سیفەتانە وەسفن بۆ وەسفکراوێك کە بریتین لەوانەی لەگەڵیدان، و دروست نییە هەریەکەیان مەبەست کەسێك بێت.

و هەندێك جار ئەو تەفسیرانە لەفزێکی ڕەهای گشتی قەتیس و سنوردار دەکەن لە

یەك کەسدا وەك ئەو قسەیەی دەڵێت: مەبەست لەوەی دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ مەبەست تەنها عەلییە.

و ئەو قسەی هەندێکیان کە دەڵێن: ئەوەی دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ٣٣﴾ مەبەست تەنها ئەبوبەکرە، و ئەوەی دەفەرموێت: ﴿لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَـٰتَلَ ۚ ١٠﴾ مەبەست تەنها ئەبوبەکرە، و هاوشێوەی ئەمانە.

(وتَفْسِيرُ ابْنِ عَطِيَّةَ وَأَمْثَالِهِ أَتْبَعُ لِلسُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ وَأَسْلَمُ مِنْ الْبِدْعَةِ مِنْ تَفْسِيرِ الزمخشري، وَلَوْ ذَكَرَ كَلَامُ السَّلَفِ الْمَوْجُودُ فِي التَّفَاسِيرِ الْمَأْثُورَةِ عَنْهُمْ عَلَى وَجْهِهِ لَكَانَ أَحْسَنَ وَأَجْمَلَ فَإِنَّهُ كَثِيرًا مَا يَنْقُلُ مِنْ تَفْسِيرِ مُحَمَّدِ بْنِ جَرِيرٍ الطبري وَهُوَ مِنْ أَجَلِّ التَّفَاسِيرِ وَأَعْظَمِهَا قَدْرًا، ثُمَّ إنَّهُ يَدَعُ مَا نَقَلَهُ ابْنُ جَرِيرٍ عَنْ السَّلَفِ لَا يَحْكِيهِ بِحَالِ، وَيَذْكُرُ مَا يَزْعُمُ أَنَّهُ قَوْلُ الْمُحَقِّقِينَ، وَإِنَّمَا يَعْنِي بِهِمْ طَائِفَةً مِنْ أَهْلِ الْكَلَامِ الَّذِينَ قَرَّرُوا أُصُولَهُمْ بِطُرُقِ مِنْ جِنْسِ مَا قَرَّرَتْ بِهِ الْمُعْتَزِلَةُ أُصُولَهُمْ، وَإِنْ كَانُوا أَقْرَبَ إلَي السُّنَّةِ مِنْ الْمُعْتَزِلَةِ؛ لَكِنْ يَنْبَغِي أَنْ يُعْطَى كُلُّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ وَيَعْرِفَ أَنَّ هَذَا مِنْ جُمْلَةِ التَّفْسِيرِ عَلَي الْمَذْهَبِ؛ فَإِنَّ الصَّحَابَةَ وَالتَّابِعِينَ وَالْأَئِمَّةَ إذَا كَانَ لَهُمْ فِي تَفْسِيرِ الْآيَةِ قَوْلٌ وَجاءَ قَوْمٌ فَسَّرُوا الْآيَةَ بِقَوْلِ آخرَ لِأَجْلِ مَذْهَبٍ اعْتَقَدُوهُ، وَذَلِكَ الْمَذْهَبُ لَيْسَ مِنْ مَذَاهِبِ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ لَهُمْ بِإِحْسَانِ، صَارُوا مُشَارِكِينَ لِلْمُعْتَزِلَةِ وَغَيْرِهِمْ مِنْ أَهْلِ الْبِدَعِ فِي مِثْلِ هَذَا).

واتە: تەفسیری ئیبن عەتییە و هاوشێوەکانی زیاتر شوێنی سوننەت و جەماعەت کەوتووە و سەلامەتترە لە بیدعە بەراورد بە تەفسیری زەمەخشەری، و ئەگەر باسی قسەی سەلەفی بکردایە کە بوونی هەیە لەو تەفسیرانەدا و لێیانەوە گێڕدراوەتەوە

بەشێوەی خۆی ئەوە باشتر و جوانتربوو، چونکە زۆر جار لە تەفسیری محمدی کوڕی جەریری تەبەرییەوە نەقڵ دەکات کەلە باشترین تەفسیرەکانە و لە هەموویان پلەوپایەی مەزنترە، پاشان واز دەهێنێت لەوەی کە ئیبن جەریر لە سەلەفەوە نەقڵی کردووە و بەهیچ شێوەیەك باسی ناکات، و باسی ئەوە دەکات کە بە قسەی خۆی قسەی لێکۆڵەرەکانە، و مەبەستی کۆمەڵێکە لە ئەهلی کەلام کە بنەماکانی خۆیان سەلماندووە بەچەند ڕێگەیەك لە ڕەگەزی ئەو ڕێگایانەیە کە موعتەزیلە بنەماکانی مەزهەبەکەیان پێ سەلماندووە، ئەگەرچی لە موعتەزیلە نزیکترن لە سوننەتەوە، بەڵام پێویستە هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی پێ بدرێت، چونکە ئەگەر هاوەڵان و تابعییەکان و پێشەواکان بۆچوونێکیان هەبێت لە تەفسیری ئایەتێکدا، و کەسانێك بێن تەفسیری ئایەتەکە بکەن بە بۆچوونێکی تر لەبەر مەزهەبێك کە باوەڕیان پێیەتی، و ئەو مەزهەبەش لە بۆچوونی هاوەڵان و تابعییەکان و شوێنکەوتە چاکەکانیان نەبێت، دەبنە هاوبەشی موعتەزیلە و ئەوانی تر لە ئەهلی بیدعە لە هاوشێوەی ئەم پرسانە.

(وفِي الْجُمْلَةِ مَنْ عَدَلَ عَنْ مَذَاهِبِ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَتَفْسِيرِهِمْ إلَي مَا يُخَالِفُ ذَلِكَ كَانَ مُخْطِئًا فِي ذَلِكَ بَلْ مُبْتَدِعًا وَإِنْ كَانَ مُجْتَهِدًا مَغْفُورًا لَهُ خَطَؤُهُ. فَالْمَقْصُودُ بَيَانُ طُرُقِ الْعِلْمِ وَأَدِلَّتِهِ وَطُرُقِ الصَّوَابِ، وَنَحْنُ نَعْلَمُ أَنَّ الْقُرْآنَ قَرَأَهُ الصَّحَابَةُ وَالتَّابِعُونَ وَتَابِعُوهُمْ وَأَنَّهُمْ كَانُوا أَعْلَمَ بِتَفْسِيرِهِ وَمَعَانِيهِ، كَمَا أَنَّهُمْ أَعْلَمُ بِالْحَقِّ الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ بِهِ رَسُولَهُ ﷺ؛ فَمَنْ خَالَفَ قَوْلَهُمْ وَفَسَّرَ الْقُرْآنَ بِخِلَافِ تَفْسِيرِهِمْ فَقَدْ أَخْطَأَ فِي الدَّلِيلِ وَالْمَدْلُولِ جَمِيعاً).

واتە: بەشێوەکی گشتی هەرکەسێك لە مەزهەبەکانی هاوەڵان و تابعییەکان و تەفسیریان لا بدات بۆ ئەوەی پێچەوانەیانە لەوەدا هەڵەیە بەڵکو موبتەدیعە، ئەگەر موجتەهید بێت هەڵەکەی خوا ﷻ لێی خۆش دەبێت.

مەبەست ڕوونکردنەوە ڕێگاکانی زانست و بەڵگەکان و ڕێگاکانی پێکانی حەقە، ئێمە دەزانین قورئان هاوەڵان و تابعییەکان و تابعی تابعییەکان خوێندوویانەتەوە، و ئەوانە زاناتربوون لە تەفسیر و ماناکانی، وەك چۆن زاناتربوون بەو حەقەی خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ پێ ڕەوانەکردووە، هەرکەسێك پێچەوانەی قسەیان بکات و تەفسیری قورئان بکات بە پێچەوانەی تەفسیری ئەوان بێگومان لە بەڵگە و مانا و لێکدانەوەشی هەڵەی کردووە.

(وَمَعْلُومٌ أَنَّ كُلَّ مَنْ خَالَفَ قَوْلَهُمْ لَهُ شُبْهَةٌ يَذْكُرُهَا إمَّا عَقْلِيَّةٌ وَإِمَّا سَمْعِيَّةٌ؛ كَمَا هُوَ مَبْسُوطٌ فِي مَوْضِعِهِ، والْمَقْصُودُ هُنَا: التَّنْبِيهُ عَلَي مَثَارِ الِاخْتِلَافِ فِي التَّفْسِيرِ، وَأَنَّ مِنْ أَعْظَمِ أَسْبَابِهِ الْبِدَعَ الْبَاطِلَةَ الَّتِي دَعَتْ أَهْلَهَا إلَى أَنْ حَرَّفُوا الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ، وَفَسَّرُوا كَلَامَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ ﷺ بِغَيْرِ مَا أُرِيدَ بِهِ وَتَأَوَّلُوهُ عَلَي غَيْرِ تَأْوِيلِهِ.

فَمِنْ أُصُولِ الْعِلْمِ بِذَلِكَ: أَنْ يَعْلَمَ الْإِنْسَانُ الْقَوْلَ الَّذِي خَالَفُوهُ، وَأَنَّهُ الْحَقُّ، وَأَنْ يَعْرِفَ أَنَّ تَفْسِيرَ السَّلَفِ يُخَالِفُ تَفْسِيرَهُمْ، وَأَنْ يَعْرِفَ أَنَّ تَفْسِيرَهُمْ مُحْدَثٌ مُبْتَدَعٌ، ثُمَّ أَنْ يَعْرِفَ بِالطُّرُقِ الْمُفَصَّلَةِ فَسَادَ تَفْسِيرِهِمْ بِمَا نَصَبَهُ اللَّهُ مِنْ الْأَدِلَّةِ عَلَى بَيَانِ الْحَقِّ، وَكَذَلِكَ وَقَعَ مِنْ الَّذِينَ صَنَّفُوا فِي شَرْحِ الْحَدِيثِ وَتَفْسِيرِهِ مِنْ الْمُتَأَخِّرِينَ مِنْ جِنْسِ مَا وَقَعَ فِيمَا صَنَّفُوهُ مِنْ شَرْحِ الْقُرْآنِ وَتَفْسِيرِهِ.

وَأَمَّا الَّذِينَ يُخْطِئُونَ فِي الدَّلِيلِ لَا فِي الْمَدْلُولِ؛ فَمِثْلُ كَثِيرٍ مِنْ الصُّوفِيَّةِ وَالْوُعَّاظِ وَالْفُقَهَاءِ وَغَيْرِهِمْ، يُفَسِّرُونَ الْقُرْآنَ بِمَعَانٍ صَحِيحَةٍ؛ لَكِنَّ الْقُرْآنَ لَا يَدُلُّ عَلَيْهَا؛ مِثْلَ كَثِيرٍ مِمَّا ذَكَرَهُ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ السلمي فِي حَقَائِقِ التَّفْسِيرِ، وَإِنْ كَانَ

فِيمَا ذَكَرُوهُ مَا هُوَ مَعَانٍ بَاطِلَةٌ فَإِنَّ ذَلِكَ يَدْخُلُ فِي الْقِسْمِ الْأَوَّلِ وَهُوَ الْخَطَأُ فِي الدَّلِيلِ وَالْمَدْلُولِ جَمِيعًا حَيْثُ يَكُونُ الْمَعْنَى الَّذِي قَصَدُوهُ فَاسِداً).

واتە: زانراوە هەرکەسێك پێچەوانەی قسەیان بکات گومانێکی (شبهة) هەیە، ئەو شوبهەیە عەقڵییە یان بیستوویەتی باسی دەکات، ئەوە بەدرێژی لە شوێنی خۆیدا باسکراوە، مەبەست لێرە: ئاگادارکردنەوەیە لە پاڵنەر و هۆکاری ناکۆکی لە تەفسیردا، لە گەورەترین پاڵنەر و هۆکارەکانی بیدعە پووچەڵەکانە کە خاوەنەکانی هانداوە مانای ئایەتەکان تێکبدەن و لە مانا ڕاستەکەی لای بدەن، و تەفسیری فەرموودەی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بەجگە لەوەی ویستویانە بکەن، و لێکدانەوەیان بۆ ئایەتەکان کردووە بەجگە لەو لێکدانەوەی کە پێویستە لێکدانەوەی بۆ بکرێت.

لە بنەماکانی زانست لەو بوارەدا ئەوەیە: مرۆڤ بزانێت ئەو قسەیەی کە پێچەوانەی سەلەفیان کردووە، قسە و بۆچوونی سەلەف حەق و ڕاستە، و تەفسیری سەلەف پێچەوانەی تەفسیری ئەوانە، و پێویستە بزانێت تەفسیرەکەیان داهێنراوە و بیدعەیە، پاشان بە ڕێگایەکی تێروتەسەل خراپی ئەو تەفسیرە بزانێت کە پێچەوانەی تەفسیری ئەوانە، بەو بەڵگانەی خوا ﷻ دایناوە لەسەر ڕوونکردنەوەی حەق، هەروەها ئەو کەسانەی لە شەرح و تەفسیری فەرموودەدا کتێبیان نوسیوە لە زانایانی ئەم دواییانە، لە ڕەگەزی ئەوەیە ڕوویداوە کەلە بابەتی شەرح و تەفسیری قورئان نوسیویانە.

بەڵام ئەو کەسانەی هەڵە دەکەن لە بەڵگەدا نەوەك لە لێکدانەوەی مانا و مەبەست، وەك زۆربەی صۆفییەکان و ئامۆژگاریکارەکان و شەرعزانەکان و جگە لەوانیشن، قورئان تەفسیر دەکەن بە مانا و لێکدانەوەی ڕاست و دروست، بەڵام قورئان بەڵگە نییە لەسەر

لێکدانەوەکەیان، وەك زۆربەی ئەوەی ئەبوعبدالرحمانی سولەمی لە (حقائق التفسیر)دا باسیکردووە، ئەگەر ئەوەی باسیان کرد ماناکانی پووچەڵ بێت ئەوە بەشی یەکەم دەیگرێتەوە کە کردنە بەڵگەی هەڵە و لێکدانەوە و مەبەستی هەیە ئەگەر ئەو مانایەی دەیکەنە بەڵگە لەسەری و مەبەستییانە پووچەڵ بێت.

(فَصْلٌ[١]:

فَإِنْ قَالَ قَائِلٌ: فَمَا أَحْسَنُ طُرُقِ التَّفْسِيرِ؟

فَالْجَوَابُ: أَنَّ أَصَحَّ الطُّرُقِ فِي ذَلِكَ: أَنْ يُفَسَّرَ الْقُرْآنُ بِالْقُرْآنِ، فَمَا أُجْمِلَ فِي مَكَانٍ فَإِنَّهُ قَدْ فُسِّرَ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ وَمَا اُخْتُصِرَ مِنْ مَكَانٍ فَقَدْ بُسِطَ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ..).

**واتە: فەسڵێك:**

**ئەگەر كەسێك بپرسێت: كام ڕێگا باشترین ڕێگای تەفسیرە؟**

**وەڵامەكەی ئەوەیە: صەحیحترین ڕێگا لەو بوارەدا: قورئان بە قورئان تەفسیر بكرێت، ئەوەی لە شوێنێك بە پوختی باسكرابێت، لە شوێنێكی تر تەفسیركراوە، و ئەوەی لە شوێنێك بە كورتی باسكرابێت لە شوێنێكی تر بە درێژی باسكراوە.**

(فَإِنْ أَعْيَاك ذَلِكَ فَعَلَيْك بِالسُّنَّةِ فَإِنَّهَا شَارِحَةٌ لِلْقُرْآنِ وَمُوَضِّحَةٌ لَهُ؛ بَلْ قَدْ قَالَ الْإِمَامُ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ مُحَمَّدُ بْنُ إدْرِيسَ الشَّافِعِيُّ: كُلُّ مَا حَكَمَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَهُوَ مِمَّا فَهِمَهُ مِنْ الْقُرْآنِ.

(١). ئایا ئەم فەسڵە و فەسڵی كۆتایی لە نوسینەكەی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییەیە یان لەپێشەكی تەفسیرەكەی ئیبن كەسیرە و لەگەڵیدا تێكەڵكراوە، هەندێك دەڵێن: بە چەند قەرینەیەك ئەم دوو فەسڵە لە نوسینی ئیبن تەیمیە نییە، لەو قەرینانە ئەوەی لەم دوو فەسڵەدا هاتووە ئیبن تەیمیە پێشتر باسیكردووە، و لەم دوو فەسڵەدا سەنەدی ئەسەرەكان باسكراوە كە ئەوە عادەتی ئیبن تەیمیە نییە، و چەند قەرینەیەكی تر باسكراوە، و زۆر لە پێشەكییەكەی تەفسیری ئیبن كەسیر دەچێت، بەڵام من لە شەرحكردنی ئەم كتێبە زۆر سودم لە شەرحەكەی ئیبن عوسەیمین و صالح ئال الشیخ وەرگرتووە و هیچ ئاماژەیەكیان بەوە نەكردووە، بۆیە ناتوانرێت بە تەنها گومان و بێ بەڵگەی حاشا هەڵنەگر گومان بخرێتە سەر كتێب و نوسراوی زانایان، والله أعلم.

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ١٠٥﴾(النِّسَاء)، وَقَالَ تَعَالَى: ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ٤٤﴾(النَّحل)، وَقَالَ تَعَالَى: ﴿وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٦٤﴾(النَّحل)، وَلِهَذَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ((أَلَا إِنِّي أُوتِيت الْقُرْآنَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ" يَعْنِي السُّنَّةَ"))[١]).

واتە: ئەگەر لەوەدا ماندوو بوویت و دەستت نەکەوت، دەست بە سوننەتەوە بگرە چونکە شەرحی قورئانی کردووە و ڕوونی کردووەتەوە، بەڵکو ئیمام ئەبوعبداللە محمدی کوڕی ئیدریسی شافعی دەڵێت: هەموو ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ حوکمی لەبارەیەوەداوە، لە قورئانەوە تێیگەیشتووە.

خوا ﷻ دەفەرموێت: بێگومان ئێمە قورئانمان بۆ دابەزاندوویت کە ڕاست و ڕەوایە، بۆ ئەوەی حوکم بکەیت لە نێوان خەڵکدا بەوشێوەی کە خوا نیشانت دەدات و فێرت دەکات، داکۆکی و بەرگری مەکە لە کەسانی ناپاك.

و دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاندووە، بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوون بکەیتەوە ئەوەی بۆیان دابەزێنراوە، بەڵکو تێڕابمێنن و بیربکەنەوە و پەند و ئامۆژگاری وەربگرن.

و دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ دانەبەزاندوویت بۆ ئەوە نەبێت کێشە و ناکۆکییەکانیان بۆ ڕوون بکەیتەوە، حەق و باتڵ لەیەك جیا بکەیتەوە، هۆکاری هیدایەت و ڕەحمەتە بۆ ئەو کەسانەی باوەڕ دەهێنن.

(١). أخرجه أحمد وأبو داود وصححه الألباني.

لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: بێگومان من قورئان و هاوشێوەیم (واتە: سوننەت) پێبەخشراوە.

(وَالسُّنَّةُ أَيْضًا تَنْزِلُ عَلَيْهِ بِالْوَحْيِ كَمَا يَنْزِلُ الْقُرْآنُ؛ لَا أَنَّهَا تُتْلَى كَمَا يُتْلَى، وَقَدْ اسْتَدَلَّ الْإِمَامُ الشَّافِعِيُّ وَغَيْرُهُ مِنْ الْأَئِمَّةِ عَلَي ذَلِكَ بِأَدِلَّةٍ كَثِيرَةٍ لَيْسَ هَذَا مَوْضِعَ ذَلِكَ.
الْغَرَضُ أَنَّك تَطْلُبُ تَفْسِيرَ الْقُرْآنِ مِنْهُ فَإِنْ لَمْ تَجِدْهُ فَمِنْ السُّنَّةِ، كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِمُعَاذِ حِينَ بَعَثَهُ إلَي الْيَمَنِ: ((بِمَ تَحْكُمُ؟

قَالَ: بِكِتَابِ اللَّهِ.

قَالَ: فَإِنْ لَمْ تَجِدْ؟

قَالَ: بِسُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ.

قَالَ: فَإِنْ لَمْ تَجِدْ؟

قَالَ: أَجْتَهِدُ رَأْيِي .

قَالَ: فَضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي صَدْرِهِ وَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ اللَّهِ لِمَا يُرْضِي رَسُولَ اللَّهِ)) وَهَذَا الْحَدِيثُ فِي الْمَسَانِدِ وَالسُّنَنِ بِإِسْنَادِ جَيِّدٍ[1]).

واتە: هەروەها سوننەت بە وەحی دادەبەزێت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وەك چۆن قورئان بە وەحی دادەبەزێت، مەبەست ئەوە نییە دەخوێندرێتەوە وەك چۆن قورئان دەخوێندرێتەوە، ئیمامی شافعی و جگە لەویش لە پێشەواكان بەڵگەی زۆریان لەسەر ئەوە هێناوەتەوە ئێرە شوێنی باسكردنی نییە.

(١). أخرجه الترمذي وضعفه الألباني.

مەبەست ئەوەیە بە دوای تەفسیری قورئاندا بگەڕێیت لە قورئان، ئەگەر دەستت نەکەوت و نەتدۆزییەوە لە سوننەتدا بە دوایدا بگەڕێیت، وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك موعازی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: بەچی حوکم دەکەیت؟

گوتی: بە کتێبەکەی خوا .

فەرمووی: ئەگەر لە قورئاندا ئەو حوکمە بە دوایدا دەگەڕێیت دەستت نەکەوت؟

گوتی: بە سوننەتی پێغەمەری خوا ﷺ حوکم دەکەم.

فەرمووی: ئەگەر لە سوننەتیشدا دەستت نەکەوت؟

گوتی: ئیجتهاد دەکەم و بە ڕەئی خۆم حوکم دەکەم.

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی دای لەسەر سنگی و فەرمووی: سوپاس بۆ خوا کە نێردراوی پێغەمبەری خوای موەفقکرد بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ڕازی دەکات.

(وَحِينَئِذٍ إِذَا لَمْ نَجِدْ التَّفْسِيرَ فِي الْقُرْآنِ وَلَا فِي السُّنَّةِ رَجَعْنَا فِي ذَلِكَ إِلَى أَقْوَالِ الصَّحَابَةِ فَإِنَّهُمْ أَدْرَى بِذَلِكَ لِمَا شَاهَدُوهُ مِنْ الْقُرْآنِ وَالْأَحْوَالِ الَّتِي اخْتَصُّوا بِهَا؛ وَلِمَا لَهُمْ مِنْ الْفَهْمِ التَّامِّ وَالْعِلْمِ الصَّحِيحِ وَالْعَمَلِ الصَّالِحِ؛ لَاسِيَّمَا عُلَمَاؤُهُمْ وَكُبَرَاؤُهُمْ كَالْأَئِمَّةِ الْأَرْبَعَةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ وَالْأَئِمَّةِ الْمَهْدِيِّينَ، مِثْلِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ).

واتە: ئەو کاتەی تەفسیری قورئانمان لە قورئان و لە سوننەتدا دەستنەکەوت، بۆ ئەو مەبەستە دەگەڕێنەوە بۆ گوتەی هاوەڵان، چونکە ئەوان لە هەمووان زانیارییان زیاترە لەبەر ئەوەی شاهیدی دابەزینی قورئان بوون و لەبەر ئەو بارودۆخەی ئەوانی پێ تایبەتکراوە، و لەبەر تێگەیشتنی تەواو و زانستی صەحیح و کردەوەی چاکیان هەبوو،

بەتایبەت زانا و گەورەکانیان وەك چوار پێشەوا و خەلیفە ڕاشدییەکان و پێشەوا هیدایەتدراوەکان، نمونەی عبداللەی کوڕی مەسعود.

(قَالَ الْإِمَامُ أَبُو جَعْفَرٍ مُحَمَّدُ بْنُ جَرِيرٍ الطبري: حَدَّثَنَا أَبُو كريب قَالَ أَنْبَأَنَا جَابِرُ بْنُ نُوحٍ أَنْبَأَنَا الْأَعْمَشُ عَنْ أَبِي الضُّحَى عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ يَعْنِي ابْنَ مَسْعُودٍ: (وَالَّذِي لَا إلَهَ غَيْرُهُ مَا نَزَلَتْ آيَةٌ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ إلَّا وَأَنَا أَعْلَمُ فِيمَنْ نَزَلَتْ وَأَيْنَ نَزَلَتْ وَلَوْ أَعْلَمُ مَكَانَ أَحَدٍ أَعْلَمَ بِكِتَابِ اللَّهِ مِنِّي تناوله الْمَطَايَا لَأَتَيْته)[1].

وَقَالَ الْأَعْمَشُ أَيْضًا عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: (كَانَ الرَّجُلُ مِنَّا إذَا تَعَلَّمَ عَشْرَ آيَاتٍ لَمْ يُجَاوِزْهُنَّ حَتَّى يَعْرِفَ مَعَانِيَهُنَّ وَالْعَمَلَ بِهِنَّ)[2]).

واتە: ئیمام ئەبوجەعفەری محمدی کوڕی جەریری تەبەری دەڵێت: ئەبوکورەیب بۆی گێڕاینەوە دەڵێت: جابری کوڕی نوح هەواڵی پێداین، ئەعمەش هەواڵی پێداین لە ئەبوزوحاوە لە مەسروقەوە دەڵێت: عبداللە واتە: ئیبن مەسعود دەڵێت: سوێند بەو کەسەی هیچ پەرستراوێکی حەق نییە جگە لە ئەو هیچ ئایەتێك لە کتێبەکەی خوا دانەبەزیوە ئیللا من دەزانم دەربارەی کێ دابەزیوە و لە کوێ دابەزیوە، ئەگەر شوێنی کەسێك بزانم زاناتر بێت لە کتێبەکەی خوا و سواری پێدەگات دەچمە خزمەتی.

دیسان ئەعمەش لە ئەبووائلەوە لە ئیبن مەسعودەوە دەڵێت: کەسێك لە ئێمە ئەگەر فێری دە ئایەت بووایە تێی نەدەپەڕاند هەتاکو ماناکانی نەزانیایە و کردەوەی پێنەکردایە.

(١). أخرجه الطبري و الطبراني في (المعجم الكبير).
(٢). أخرجه أحمد والطبري.

(وَمِنْهُمْ الْحَبْرُ الْبَحْرُ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ، ابْنُ عَمِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَتُرْجُمَانِ الْقُرْآنِ بِبَرَكَةِ دُعَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَهُ حَيْثُ قَالَ: ((اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ وَعَلِّمْهُ التَّأْوِيلَ))[١].

وَقَالَ ابْنُ جَرِيرٍ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ أَنْبَأَنَا وَكِيعٌ أَنْبَأَنَا سُفْيَانُ عَنْ الْأَعْمَشِ عَنْ مُسْلِمٍ عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ يَعْنِي ابْنَ مَسْعُودٍ: (نِعْمَ تُرْجُمَانُ الْقُرْآنِ ابْنُ عَبَّاسٍ)[٢].

ثُمَّ رَوَاهُ عَنْ يَحْيَى بْنِ داود عَنْ إسْحَاقَ الْأَزْرَقِ عَنْ سُفْيَانَ عَنْ الْأَعْمَشِ عَنْ مُسْلِمِ بْنِ صُبَيْحٍ أَبِي الضُّحَى عَنْ مَسْرُوقٍ عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ أَنَّهُ قَالَ: (نِعْمَ التُّرْجُمَانُ لِلْقُرْآنِ ابْنُ عَبَّاسٍ).

ثُمَّ رَوَاهُ عَنْ بُنْدَارٍ عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَوْنٍ عَنْ الْأَعْمَشِ بِهِ كَذَلِكَ).

**واتە: و لەو هاوەڵانەی زانای تەفسیر کە زانستی وەك دەریا فراوانە عبداللەی کوڕی عەباسی ئامۆزای پێغەمبەری خوایە ﷺ، لێکدەرەوە و شیکەرەوەی مانای قورئانە بە بەرەکەتی دوعای پێغەمبەری خوا ﷺ کە پێی فەرمووە: پەروەردگارا لە ئاین تێیبگەیەنە و فێری تەفسیر و لێکدانەوەی قورئانی بکە.**

**ئیبن جەریر دەڵێت: محمدی کوڕی بەشار بۆی گێڕاینەوە وەکیع هەواڵی پێداین سوفیان هەواڵی پێداین لە ئەعمەشەوە لە موسلمەوە لە مەسروقەوە دەڵێت: عبداللە واتە: ئیبن مەسعود دەڵێت: باشترین ڕاڤەکار و لێکدەرەوەی قورئان ئیبن عەباسە.**

(١). أخرجه أحمد وصححه الألباني.
(٢). أخرجه حاكم وصححه الألباني.

پاشان یەحیای کوڕی داود لە ئیسحاقی ئەزرەقەوە لە سوفیانەوە لە ئەعمەشەوە لە مسلمی کوڕی صوبەیح ئەبوزوحەیەوە لە مەسروقەوە لە ئیبن مەسعودەوە ڕیوایەتی کردووە، دەڵێت: باشترین ڕاڤەکار و لێکدەرەوەی قورئان ئیبن عەباسە.

پاشان لە بوندارەوە لە جەعفەری کوڕی عەونەوە لە ئەعمەشەوە بەوشێوەیە ڕیوایەتی کردووە.

(فَهَذَا إسْنَادٌ صَحِيحٌ إلَي ابْنِ مَسْعُودٍ أَنَّهُ قَالَ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ هَذِهِ الْعِبَارَةُ، وَقَدْ مَاتَ ابْنُ مَسْعُودٍ فِي سَنَةِ ثَلَاثٍ وَثَلَاثِينَ عَلَي الصَّحِيحِ، وَعَمَّرَ بَعْدَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ سِتًّا وَثَلَاثِينَ سَنَةً فَمَا ظَنُّك بِمَا كَسَبَهُ مِنْ الْعُلُومِ بَعْدَ ابْنِ مَسْعُودٍ؟.
وَقَالَ الْأَعْمَشُ عَنْ أَبِي وَائِلٍ: اسْتَخْلَفَ عَلِيٌّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ عَلَي الْمَوْسِمِ فَخَطَبَ النَّاسَ فَقَرَأَ فِي خُطْبَتِهِ سُورَةَ الْبَقَرَةِ - وَفِي رِوَايَةٍ سُورَةِ النُّورِ - فَفَسَّرَهَا تَفْسِيرًا لَوْ سَمِعَتْهُ الرُّومُ وَالتُّرْكُ وَالدَّيْلَمُ لَأَسْلَمُوا)[١].

واتە: ئەمە سەنەدێکی صەحیحە لە ئیبن مەسعودە کە دەربارەی ئیبن عەباس ئەم عیبارەتەی گوتووە، و ئیبن مەسعود لەساڵی سی و سێ لەسەر ڕیوایەتی صەحیح وەفاتی کردووە، و ئیبن عەباس سی و شەش ساڵ دوای ئەو ژیاوە، گومانت چۆنە و دەبێت چەندی تر لە زانستە شەرعییەکان بەدەست هێنابێت.

و ئەعمەش لە ئەبووائلەوە دەڵێت: عەلی رضي الله عنه عبداللەی کوڕی مەسعودی دیاریکرد حەج بەڕێوە ببات، گوتاری بۆ خەڵك خوێندەوە لە گوتارەکەیدا سورەتی البقرەی

(١). أخرجه الطبري.

خوێندەوە و لە ڕیوایەتێکدا سورەتی النوری خوێندەوە بەشێوەیەك تەفسیری کرد ئەگەر ڕۆم و تورك و دەیلەم گوێیان لێبووایە موسڵمان دەبوون.

(وَلِهَذَا غَالِبُ مَا يَرْوِيهِ إسْمَاعِيلُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ السدي الْكَبِيرُ فِي تَفْسِيرِهِ عَنْ هَذَيْنِ الرَّجُلَيْنِ: ابْنِ مَسْعُودٍ وَابْنِ عَبَّاسٍ، وَلَكِنْ فِي بَعْضِ الْأَحْيَانِ يَنْقُلُ عَنْهُمْ مَا يَحْكُونَهُ مِنْ أَقَاوِيلِ أَهْلِ الْكِتَابِ الَّتِي أَبَاحَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَيْثُ قَالَ: ((بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إسْرَائِيلَ وَلَا حَرَجَ وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ)) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو؛ وَلِهَذَا كَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو قَدْ أَصَابَ يَوْمَ الْيَرْمُوكِ زَامِلَتَيْنِ مِنْ كُتُبِ أَهْلِ الْكِتَابِ فَكَانَ يُحَدِّثُ مِنْهُمَا بِمَا فَهِمَهُ مِنْ هَذَا الْحَدِيثِ مِنْ الْإِذْنِ فِي ذَلِكَ[١]).

واتە: بۆیە زۆربەی ئەوەی ئیسماعیلی کوڕی عبدالرحمانی سودی کەبیر لە تەفسیرەکەیدا دەیگێڕێتەوە لەم دوو پیاوەوە ڕیوایەتی کردووە: ئیبن مەسعود و ئیبن عەباس، بەڵام هەندێك کات قسەی خاوەن کتێبەکانیان لێوە نەقلْ دەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕانەوەی حەڵاڵکردووە کاتێك فەرموویەتی: لە منەوە بیگەیەنن ئەگەر ئایەتێکیش بێت، و لە نەوەکانی ئیسرائیلەوە شت بگێڕنەوە حەڵاڵە و تاوانتان ناگات، هەرکەسێك درۆ بە ناوی منەوە بکات جێگای خۆی لە دۆزەخدا بگرێت؛ بوخاری ئەم فەرموودەیەی لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە ڕیوایەتکردووە، بۆیە کاتێك عبداللەی کوڕی

(١). أخرجه الدارمي.

عەمر دوو زەمبیله له کتێبەکانی خاوەن کتێبەکانی دەستکەوت، شتی لەو کتێبانەوە دەگێڕایەوە بەوەی لەم فەرموودەیەوە تێیگەیشتبوو کە ڕوخسەتی پێداوە.

(وَلَكِنَّ هَذِهِ الْأَحَادِيثَ الإسرائيلية تُذْكَرُ لِلِاسْتِشْهَادِ لَا لِلِاعْتِقَادِ فَإِنَّهَا عَلَى ثَلَاثَةِ أَقْسَامٍ:

أَحَدُهَا: مَا عَلِمْنَا صِحَّتَهُ مِمَّا بِأَيْدِينَا مِمَّا يَشْهَدُ لَهُ بِالصِّدْقِ فَذَاكَ صَحِيحٌ .

والثَّانِي: مَا عَلِمْنَا كَذِبَهُ بِمَا عِنْدَنَا مِمَّا يُخَالِفُهُ.

والثَّالِثُ: مَا هُوَ مَسْكُوتٌ عَنْهُ لَا مِنْ هَذَا الْقَبِيلِ وَلَا مِنْ هَذَا الْقَبِيلِ فَلَا نُؤْمِنُ بِهِ وَلَا نُكَذِّبُهُ وَتَجُوزُ حِكَايَتُهُ لِمَا تَقَدَّمَ، وَغَالِبُ ذَلِكَ مِمَّا لَا فَائِدَةَ فِيهِ تَعُودُ إلَى أَمْرٍ دِينِيٍّ، وَلِهَذَا يَخْتَلِفُ عُلَمَاءُ أَهْلِ الْكِتَابِ فِي مِثْلِ هَذَا كَثِيرًا وَيَأْتِي عَنْ الْمُفَسِّرِينَ خِلَافٌ بِسَبَبِ ذَلِكَ).

واته: ئەم ئەسەرە ئیسرائیلییانە باسی دەکرێت بۆ شاهیدی نەوەك بۆ باوەڕ پێهێنان، چونکە سێ بەشن:

یەکەمیان: بەهۆی ئەو بەڵگانەی بەدەستمانەوەیە دەزانین صەحیحە و شاهیدی ڕاستی بۆ دەدەن ئەوە صەحیحە.

دووەم: ئەوەی دەزانین درۆیە بەو بەڵگانەی بەدەستمانەوەیە، پێچەوانەی بەڵگەکانە.

سێیەم: ئەوەی بێدەنگی لەسەرکراوە لە جۆری یەکەم و دووەم نییە، نەباوەڕمان پێیەتی و نەبە درۆی دەخەینەوە و دروستە بگێڕدرێتەوە بەو بەڵگانەی پێشوو، و زۆربەی ئەوانە سودی تێدا نییە لەبارەی پرسێکی ئاینییەوە، لەبەر ئەوە زاناکانی خاوەن کتێبەکان زۆر ناکۆکن لەوبارەیەوە، و بەو هۆیەشەوە ڕاڤەکارانی قورئان ناکۆك دەبن.

(كَمَا يَذْكُرُونَ فِي مِثْلِ هَذَا أَسْمَاءَ أَصْحَابِ الْكَهْفِ وَلَوْنَ كَلْبِهِمْ وَعِدَّتَهُمْ وَعَصَا مُوسَي مِنْ أَيِّ الشَّجَرِ كَانَتْ؟ وَأَسْمَاءَ الطُّيُورِ الَّتِي أَحْيَاهَا اللَّهُ لِإِبْرَاهِيمَ، وَتَعْيِينَ الْبَعْضِ الَّذِي ضُرِبَ بِهِ الْقَتِيلُ مِنْ الْبَقَرَةِ وَنَوْعَ الشَّجَرَةِ الَّتِي كَلَّمَ اللَّهُ مِنْهَا مُوسَى إلَي غَيْرِ ذَلِكَ مِمَّا أَبْهَمَهُ اللَّهُ فِي الْقُرْآنِ مِمَّا لَا فَائِدَةَ فِي تَعْيِينِهِ تَعُودُ عَلَي الْمُكَلَّفِينَ فِي دُنْيَاهُمْ وَلَا دِينِهِمْ، وَلَكِنَّ نَقْلَ الْخِلَافِ عَنْهُمْ فِي ذَلِكَ جَائِزٌ، كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿سَيَقُولُونَ ثَلَاثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًا بِٱلْغَيْبِ ۖ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ ۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴿٢٢﴾﴾(الكَهْف).

فَقَدْ اشْتَمَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ الْكَرِيمَةُ عَلَي الْأَدَبِ فِي هَذَا الْمَقَامِ وَتَعْلِيمِ مَا يَنْبَغِي فِي مِثْلِ هَذَا؛ فَإِنَّهُ تَعَالَى أَخْبَرَ عَنْهُمْ بِثَلَاثَةِ أَقْوَالٍ ضَعَّفَ الْقَوْلَيْنِ الْأَوَّلَيْنِ وَسَكَتَ عَنْ الثَّالِثِ فَدَلَّ عَلَي صِحَّتِهِ؛ إذْ لَوْ كَانَ بَاطِلًا لَرَدَّهُ كَمَا رَدَّهُمَا).

واتە: وەك ئەوەی باسی دەكەن دەربارەی ناوی هاوەڵانی ئەشكەوت و جۆری سەگەكەیان و ژمارەیان، و گۆچانەكەی پێغەمبەر موسا لەچی دارێك بووە؟، و ناوی ئەو باڵندانە چی بووە كە پێغەمبەر ئیبراهیم زیندووی كردوونەتەوە، و دیاریكردنی ئەو بەشەی مانگاكە كەلە كوژراوەكە دراوە، و جۆری ئەو درەختەی كە خوا ﷻ لێوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر موسا كردووە، و ئەو شتانەی تریش كە قورئان بە نەزانراوی هێشتوویەتییەوە و دیاریكردنی سودێكی نییە بۆ بەندە تەكلیف لێكراوەكان نەلە دونیایان و نەلە ئاینیان، بەڵام گواستنەوەی ئەو ناكۆكییە لێیانەوە دروستە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێت: دەڵێن: ژمارەی هاوەڵانی ئەشكەوتەكە سێ كەس بووە و بە

سەگەکەیانەوە چوار بوون، و دەڵێن: ژمارەیان پێنج کەس بووە و بە سەگەکەیانەوە شەش بوون، بەگومان و بێ زانیاری قسە دەکەن، و دەڵێن: ژمارەیان حەوت کەس بووە بە سەگەکەیانەوە هەشت بوون، بڵێ: پەروەردگارم زاناترە بە ژمارەیان، کەس ژمارەیان نازانێت کەسانێکی کەم نەبێت، بۆیە مشتومڕ مەکە لەبارەیانەوە، مشتومڕێکی ئاشکرا نەبێت و لەو باسەدا ڕۆمەچۆ، داوای فەتوا لەبارەیانەوە لە کەس مەکە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە لەم شوێنە ئەدەبێکی تێدایە، و ئەوە فێر دەکات کە پێویستە لە هاوشێوەی ئەو باسانە بزانرێت؛ چونکە خوا ﷻ باسی سێ قسەی کردووە لێیانەوە، دوو قسەی یەکەمی بە لاواز باسکرد، و بێدەنگ بوو لە قسەی سێیەم ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئەو قسەیە، چونکە ئەگەر باتڵ بووایە ڕەتی دەکردەوە وەك چۆن ئەو دوو قسەکەی تری ڕەتکردەوە.

(ثُمَّ أَرْشَدَ إلى أَنَّ الاطِّلَاعَ عَلَي عِدَّتِهِمْ لَا طَائِلَ تَحْتَهُ فَيُقَالُ فِي مِثْلِ هَذَا: ﴿قُل رَّبِّىٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم﴾، فَإِنَّهُ مَا يَعْلَمُ بِذَلِكَ إلَّا قَلِيلٌ مِنْ النَّاسِ مِمَّنْ أَطْلَعَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ؛ فَلِهَذَا قَالَ: ﴿فَلَا تُمَارِ فِيهِمۡ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا﴾، أَيْ: لَا تُجْهِدْ نَفْسَك فِيمَا لَا طَائِلَ تَحْتَهُ وَلَا تَسْأَلْهُمْ عَنْ ذَلِكَ فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ مِنْ ذَلِكَ إلَّا رَجْمَ الْغَيْبِ).

واتە: پاشان ڕێنمایی دەکات کە زانینی ژمارەیان پێویست نییە و بۆ هاوشێوەی ئەم پرسانە دەگوترێت: بڵێ: پەروەردگارم زاناترە بە ژمارەیان، چونکە لەو پرسانەیە کەسانێکی کەم نەبێت خوا زانستی پێنەبەخشیون لەبارەیانەوە، لەبەر ئەوە

دەفەرمویێت: مشتومڕ مەکە لەبارەیانەوە، مشتومڕێکی ئاشکرا نەبێت و لەو باسەدا ڕۆمەچۆ، واتە: خۆت ماندوو مەکە لە شتێکدا کە پێویست نییە، و پرسیاریان لێمەکە لەوبارەیەوە چونکە وەڵامەکەی نازانن، بەشتێك وەڵام دەدەنەوە قسەکردنە لە پەنهان (غیب) بەبێ زانست.

(فَهَذَا أَحْسَنُ مَا يَكُونُ فِي حِكَايَةِ الْخِلَافِ: أَنْ تُسْتَوْعَبَ الْأَقْوَالُ فِي ذَلِكَ الْمَقَامِ وَأَنْ يُنَبَّهَ عَلَي الصَّحِيحِ مِنْهَا وَيُبْطَلَ الْبَاطِلُ وَتُذْكَرَ فَائِدَةُ الْخِلَافِ وَثَمَرَتُهُ؛ لِئَلَّا يَطُولَ النِّزَاعُ وَالْخِلَافُ فِيمَا لَا فَائِدَةَ تَحْتَهُ فَيَشْتَغِلُ بِهِ عَنْ الْأَهَمِّ).

واتە: باشترین هەڵوێست لە گێڕانەوەی ناکۆکیدا: ئەوەیە هەموو بۆچوونەکان لەوبارەیەوە کۆ بکرێتەوە و بۆچوونە صەحیحەکان دیاری بکرێت و تێبینی لەسەر بۆچوونە پووچەڵەکان بدرێت، و باسی سود و بەرهەمی ئەو ناکۆکییە باس بکرێت؛ بۆ ئەوەی ناکۆکی و کێشمەکێش درێژە نەکێشێت لە شتانێکدا کە سودی نییە، و سەرقاڵ نەبن و ئەوەی گرنگترە پشتگوێی بخەن.

(فَأَمَّا مَنْ حَكَى خِلَافًا فِي مَسْأَلَةٍ وَلَمْ يَسْتَوْعِبْ أَقْوَالَ النَّاسِ فِيهَا فَهُوَ نَاقِصٌ؛ إذْ قَدْ يَكُونُ الصَّوَابُ فِي الَّذِي تَرَكَهُ أَوْ يَحْكِي الْخِلَافَ وَيُطْلِقُهُ وَلَا يُنَبِّهُ عَلَي الصَّحِيحِ مِنْ الْأَقْوَالِ فَهُوَ نَاقِصٌ أَيْضًا؛ فَإِنْ صَحَّحَ غَيْرَ الصَّحِيحِ عَامِدًا فَقَدْ تَعَمَّدَ الْكَذِبَ، أَوْ جَاهِلًا فَقَدْ أَخْطَأَ.

كَذَلِكَ مَنْ نَصَبَ الْخِلَافَ فِيمَا لَا فَائِدَةَ تَحْتَهُ أَوْ حَكَى أَقْوَالًا مُتَعَدِّدَةً لَفْظًا وَيَرْجِعُ حَاصِلُهَا إلَى قَوْلٍ أَوْ قَوْلَيْنِ مَعْنًى فَقَدْ ضَيَّعَ الزَّمَانَ وَتَكَثَّرَ بِمَا لَيْسَ بِصَحِيحِ فَهُوَ كَلَابِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ وَاَللَّهُ الْمُوَفِّقُ لِلصَّوَابِ).

واتە: ئەگەر كەسێك ناكۆكییەك لە پرسێكدا بگێڕێتەوە، هەموو بۆچوونەكانی خەڵك لەو پرسەدا كۆ نەكاتەوە ئەوە كەموكورتییە؛ چونكە لەوانەیە بۆچوونی ڕاست لەوەدا بێت كە باسی نەكردووە، یان باسی ناكۆكی بكات بە ڕەهای و باسی بۆچوونی صەحیح نەكات ئەوەیش دیسان كەموكورتییە؛ ئەگەر شتێك صەحیح نەبێت بە صەحیحی دابنێت ئەوە بە ئەنقەست درۆی كردووە، و ئەگەر نەفام بێت ئەوە هەڵەی كردووە.

هەروەها ناكۆكییەك دروست بكات لە شتێكدا كە سودی نەبێت یان چەند بۆچوونێكی جیاواز لە لەفزدا باس بكات بگەڕێتەوە بۆ بۆچوونێك یان دوو بۆچوون ئەو كەسە كاتی بەفیڕۆداوە، و شتێكی فراوان كردووە كە صەحیح نییە، ئەو كەسە وەك ئەوەیە دوو پۆشاكی هەڵخەڵەتێنەری لەبەر كردبێت، خوا كەسانێك سەركەوتوو دەكات بۆ حەق و ڕاستی.

(فَصْلٌ

إذَا لَمْ تَجِدْ التَّفْسِيرَ فِي الْقُرْآنِ وَلَا فِي السُّنَّةِ وَلَا وَجَدْته عَنْ الصَّحَابَةِ فَقَدْ رَجَعَ كَثِيرٌ مِنْ الْأَئِمَّةِ فِي ذَلِكَ إلَي أَقْوَالِ التَّابِعِينَ؛ كَمُجَاهِدِ بْنِ جَبْرٍ فَإِنَّهُ كَانَ آيَةً فِي التَّفْسِيرِ كَمَا قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إسْحَاقَ: حَدَّثَنَا أَبَانُ بْنُ صَالِحٍ عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: (عَرَضْت الْمُصْحَفَ عَلَي ابْنِ عَبَّاسٍ ثَلَاثَ عرضات مِنْ فَاتِحَتِهِ إلَي خَاتِمَتِهِ أُوقِفُهُ عِنْدَ كُلِّ آيَةٍ مِنْهُ وَأَسْأَلُهُ عَنْهَا)[1].

وَبِهِ إلَى التِّرْمِذِيِّ قَالَ: حَدَّثَنَا الْحُسَيْنُ بْنُ مَهْدِيٍّ الْبَصْرِيُّ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ عَنْ مُعَمَّرٍ عَنْ قتادة قَالَ: مَا فِي الْقُرْآنِ آيَةٌ إلَّا وَقَدْ سَمِعْت فِيهَا شَيْئًا؛ وَبِهِ إلَيْهِ قَالَ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عيينة عَنْ الْأَعْمَشِ قَالَ: قَالَ مُجَاهِدٌ: لَوْ كُنْت قَرَأْت قِرَاءَةَ ابْنِ مَسْعُودٍ لَمْ أَحْتَجْ أَنْ أَسْأَلَ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ كَثِيرٍ مِنْ الْقُرْآنِ مِمَّا سَأَلْت.

وَقَالَ ابْنُ جَرِيرٍ: حَدَّثَنَا أَبُو كريب قَالَ: حَدَّثَنَا طَلْقُ بْنُ غَنَّامٍ عَنْ عُثْمَانَ الْمَكِّيِّ عَنْ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: رَأَيْت مُجَاهِدًا سَأَلَ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ تَفْسِيرِ الْقُرْآنِ وَمَعَهُ أَلْوَاحُهُ، قَالَ: فَيَقُولُ لَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ اُكْتُبْ حَتَّي سَأَلَهُ عَنْ التَّفْسِيرِ كُلِّهِ؛ وَلِهَذَا كَانَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ يَقُولُ: إذَا جَاءَك التَّفْسِيرُ عَنْ مُجَاهِدٍ فَحَسْبُك بِهِ).

واتە: فەسڵێك

ئەگەر تەفسیری قورئانت لە قورئان و سوننەتدا دەستنەكەوت، و لای هاوەڵانیش دەستت نەكەوت، زۆربەی پێشەواكان بۆ ئەو مەبەستە گەڕاونەتەوە بۆ قسەی تابعییەكان؛ وەك موجاهیدی كوڕی جەبر چونكە بلیمەت بوو لە تەفسیردا وەك محمدی

---

(١). أخرجه الطبري.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئەبانی کوڕی صالح لە موجاهیدەوە بۆی گێڕاینەوە دەڵێت: موصحەفم سێ جار پیشانی ئیبن عەباسدا لە سەرەتایەوە بۆ کۆتای لەسەر هەموو ئایەتێك دەموەستاند و پرسیارم لێ دەکرد.

و بەو سەنەدە لە ترمزییەوە دەڵێت: حوسەینی کوڕی مەهدی بەصری بۆی گێڕاینەوە عبدالرزاق بۆی گێڕاینەوە لە مەعمەرەوە لە قەتادەوە دەڵێت: لە قورئاندا ئایەتێك نییە ئیللا شتێکم لەبارەیەوە بیستووە؛ دیسان بەو سەنەدە لە ترمزییەوە دەڵێت: ئیبن ئەبوعومەر بۆی گێڕاینەوە سوفیانی کوڕی عویەینە بۆی گێڕاینەوە لە ئەعمەشەوە دەڵێت: موجاهید دەڵێت: ئەگەر وەك خوێندنەوەی ئیبن مەسعود قورئانم بخوێندایە پێویستم نەبوو پرسیار لە ئیبن عەباس بکەم دەربارەی زۆر شتی قورئان کە پرسیارم کردووە.

ئیبن جەریر دەڵێت: ئەبوکورەیب بۆی گێڕاینەوە دەڵێت: تەلقی کوڕی غەنام بۆی گێڕاینەوە لە عوسمانی مەککییەوە لە ئیبن ئەبومولەیکەوە دەڵێت: موجاهیدم بینی پرسیاری لە ئیبن عەباس دەکرد دەربارەی تەفسیری قورئان و تەختە و کاغەزی پێ بوو، دەڵێت: ئیبن عەباس پێی دەگوت: بنووسە هەتاکو پرسیاری هەموو قورئانی لێکرد، لەبەر ئەوە سوفیانی سەوری دەڵێت: ئەگەر تەفسیری قورئانت لە موجاهیدەوە بۆ هات بەستە و دەستی پێوە بگرە.

(وَكَسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، وَعِكْرِمَةَ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، وَالْحَسَنِ الْبَصْرِيِّ، وَمَسْرُوقِ بْنِ الْأَجْدَعِ، وَسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَأَبِي الْعَالِيَةِ، وَالرَّبِيعِ بْنِ أَنَسٍ، وقتادة، وَالضَّحَاكِ بْنِ مُزَاحِمٍ، وَغَيْرِهِمْ مِنْ التَّابِعِينَ وَتَابِعِيهِمْ وَمَنْ بَعْدَهُمْ؛ فَتُذْكَرُ أَقْوَالُهُمْ فِي الْآيَةِ فَيَقَعُ فِي عِبَارَاتِهِمْ تَبَايُنٌ فِي الْأَلْفَاظِ يَحْسَبُهَا مَنْ لَا عِلْمَ

عِنْدَهُ اخْتِلَافًا فَيَحْكِيهَا أَقْوَالًا، وَلَيْسَ كَذَلِكَ فَإِنَّ مِنْهُمْ مَنْ يُعَبِّرُ عَنْ الشَّيْءِ بِلَازِمِهِ أَوْ نَظِيرِهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنُصُّ عَلَي الشَّيْءِ بِعَيْنِهِ وَالْكُلُّ بِمَعْنَي وَاحِدٍ فِي كَثِيرٍ مِنْ الْأَمَاكِنِ فَلْيَتَفَطَّنْ اللَّبِيبُ لِذَلِكَ وَاَللَّهُ الْهَادِي).

واتە: و وەك سەعیدی كوڕی جوبەیر، و عیكرمەی مەولای ئیبن عەباس، عەتای كوڕی ئەبوڕەباح، حەسەنی بەصری، مەسروقی كوڕی ئەجدەع، سەعیدی كوڕی موسەیەب، ئەبوعالییە، ڕەبیعی كوڕی ئەنەس، قەتادە، و زەحاكی كوڕی موزاحم، و جگە لەوانیش لە تابعییەكان و تابعییەكانیان دوای ئەوان، قسەكانیان لەسەر ئایەتێك باس دەكرێت لە لەفزی گوزارشتەكانیان ناكۆكی دەبینرێت ئەو كەسەی زانستی نییە گومان دەبات ناكۆكن بە چەند بۆچوونێك دەیگێڕێتەوە، بەڵام وانییە چونكە هەندێك بەلازمی شتەكە گوزارشتی لێ دەكەن یان بە هاوتای، و هەیانە بە دەق ناوی خودی شتەكە دەهێنێت و هەموو یەك مانای هەیە لە زۆر شوێندا، كەسی ژیر دەبێت ئاگای لەوە بێت، و خوا ڕێنیشاندەرە.

(وَقَالَ شُعْبَةُ بْنُ الْحَجَّاجِ وَغَيْرُهُ: أَقْوَالُ التَّابِعِينَ فِي الْفُرُوعِ لَيْسَتْ حُجَّةً فَكَيْفَ تَكُونُ حُجَّةً فِي التَّفْسِيرِ؟! يَعْنِي: أَنَّهَا لَا تَكُونُ حُجَّةً عَلَى غَيْرِهِمْ مِمَّنْ خَالَفَهُمْ، وَهَذَا صَحِيحٌ أَمَّا إذَا أَجْمَعُوا عَلَى الشَّيْءِ فَلَا يُرْتَابُ فِي كَوْنِهِ حُجَّةً، فَإِنْ اخْتَلَفُوا فَلَا يَكُونُ قَوْلُ بَعْضِهِمْ حُجَّةً عَلَي بَعْضٍ، وَلَا عَلَى مَنْ بَعْدَهُمْ وَيُرْجَعُ فِي ذَلِكَ إلَي لُغَةِ الْقُرْآنِ أَوْ السُّنَّةِ أَوْ عُمُومِ لُغَةِ الْعَرَبِ أَوْ أَقْوَالِ الصَّحَابَةِ فِي ذَلِكَ).

واتە: شوعبەی كوڕی حەجاج و جگە لەویش دەڵێن: قسەی تابعییەكان لە فەرعەكاندا بەڵگە نییە چۆن لە تەفسیردا بەڵگەیە؟ واتە: بەڵگە نییە بەسەر ئەوانی ترەوە كە ناكۆكبن لەگەڵیان، ئەمەش ڕاستە بەڵام ئەگەر ئیجماعیان هەبوو لەسەر شتێك گومانی

تێدا نییه بەڵگەیە، ئەگەر ناكۆك بوون ئەو كاتە قسەی هەندێكیان بەسەر هەندێكی تریانەوە بەڵگە نییە، هەروەها بەسەر ئەوانەی دوای خۆیان بۆ ئەو مەبەستەش دەگەڕێنەوە بۆ زمانی قورئان یان سوننەت یان گشتێتی زمانی عەرەب یان بۆچوونی هاوەڵان لەوبارەیەوە.

(فَأَمَّا تَفْسِيرُ الْقُرْآنِ بِمُجَرَّدِ الرَّأْيِ فَحَرَامٌ حَدَّثَنَا مُؤَمَّلٌ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْأَعْلَي عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ((مَنْ قَالَ فِي الْقُرْآنِ بِغَيْرِ عِلْمٍ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ))[1].

حَدَّثَنَا وَكِيعٌ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ عَبْدِ الْأَعْلَي الثَّعْلَبِيِّ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ((مَنْ قَالَ فِي الْقُرْآنِ بِغَيْرِ عِلْمٍ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ)).

واتە: تەفسیری قورئان بەتەنها ڕەئی حەرامە، موئەمەل بۆی گێڕاینەوە سوفیان بۆی گێڕاینەوە عبدالئەعلا بۆی گێڕاینەوە لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە لە ئیبن عەباسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەركەسێك قسە لە قورئاندا بكات بەبێ زانستی باجێگای خۆی لە ئاگری دۆزەخدا بگرێت.

وەكیع بۆی گێڕاینەوە سوفیان بۆی گێڕاینەوە لە عبدالئەعلاوە لە سەعلەبییەوە لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە لە ئیبن عەباسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەركەسێك قسە لە قورئاندا بكات بەبێ زانستی باجێگای خۆی لە ئاگری دۆزەخدا بگرێت.

---

(١). أخرجه أحمد و الترمذي والنسائي في (الكبرى) وضعفه الألباني.

(وَبِهِ إِلَى التِّرْمِذِيِّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ بْنُ حميد حَدَّثَنِي حَسَّانُ بْنُ هِلَالٍ قَالَ حَدَّثَنَا سُهَيْلٌ أَخُو حَزْمٍ القطعي قَالَ حَدَّثنا أَبُو عِمْرَانَ الجوني عَنْ جُنْدُبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ((مَنْ قَالَ فِي الْقُرْآنِ بِرَأْيِهِ فَأَصَابَ فَقَدْ أَخْطَأَ))[١]؛ قَالَ التِّرْمِذِيُّ: هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ وَقَدْ تَكَلَّمَ بَعْضُ أَهْلِ الْحَدِيثِ فِي سُهَيْلِ بْنِ أَبِي حَزْمٍ، وَهَكَذَا رَوَى بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ أَنَّهُمْ شَدَّدُوا فِي أَنْ يُفَسَّرَ الْقُرْآنُ بِغَيْرِ عِلْمٍ؛ وَأَمَّا الَّذِي رُوِيَ عَنْ مُجَاهِدٍ وقتادة وَغَيْرِهِمَا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّهُمْ فَسَّرُوا الْقُرْآنَ فَلَيْسَ الظَّنُّ بِهِمْ أَنَّهُمْ قَالُوا فِي الْقُرْآنِ وَفَسَّرُوهُ بِغَيْرِ عِلْمٍ أَوْ مِنْ قِبَلِ أَنْفُسِهِمْ).

واتە: و بەو سەنەدە لە ترمزییەوە دەڵێت: عەبدی کوڕی حومەید بۆی گێڕاینەوە حەسانی کوڕی هیلال بۆی گێڕامەوە گوتی سوهەیلی برای حەزمی قەتعی بۆی گێڕاینەوە دەڵێت: ئەبوعیمرانی جونی بۆی گێڕاینەوە لە جوندبەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەرکەسێك لەسەر قورئان بە ڕەئی خۆی قسە بکات بیپێکێت هەڵەی کردووە؛ ترمزی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە غەریبە و هەندێ لە ئەهلی فەرموودە قسەیان لەسەر سوهەیلی کوڕی ئەبوحەزم کردووە؛ بەڵام ئەوەی لە موجاهید و قەتادە و جگە لەوانیشەوە لە زانایانەوە ڕیوایەتکراوە کە قورئانیان تەفسیرکردووە گومانی ئەوەیان پێنابرێت قسەیان دەربارەی کردبێت و تەفسیریان کردبێت بەبێ زانست یان بە ڕەئی خۆیان.

(١). أخرجه الترمذي وضعفه الألباني.

(وَقَدْ رُوِى عَنْهُمْ مَا يَدُلُّ عَلَي مَا قُلْنَا أَنَّهُمْ لَمْ يَقُولُوا مِنْ قِبَلِ أَنْفُسِهِمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَمَنْ قَالَ فِي الْقُرْآنِ بِرَأْيِهِ فَقَدْ تَكَلَّفَ مَا لَا عِلْمَ لَهُ بِهِ، وَسَلَكَ غَيْرَ مَا أُمِرَ بِهِ، فَلَوْ أَنَّهُ أَصَابَ الْمَعْنَى فِي نَفْسِ الْأَمْرِ لَكَانَ قَدْ أَخْطَأَ؛ لِأَنَّهُ لَمْ يَأْتِ الْأَمْرُ مِنْ بَابِهِ كَمَنْ حَكَمَ بَيْنَ النَّاسِ عَلَي جَهْلٍ فَهُوَ فِي النَّارِ، وَإِنْ وَافَقَ حُكْمُهُ الصَّوَابَ فِي نَفْسِ الْأَمْرِ؛ لَكِنْ يَكُونُ أَخَفَّ جُرْمًا مِمَّنْ أَخْطَأَ وَاللَّهُ أَعْلَمُ.

وَهَكَذَا سَمّى اللَّهُ تَعَالَى الْقَذَفَةَ كَاذِبِينَ فَقَالَ: ﴿فَإِذْ لَمْ يَأْتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ۝١٣﴾(النُّور)، فَالْقَاذِفُ كَاذِبٌ، وَلَوْ كَانَ قَدْ قَذَفَ مَنْ زَنَى فِي نَفْسِ الْأَمْرِ؛ لِأَنَّهُ أَخْبَرَ بِمَا لَا يَحِلُّ لَهُ الْإِخْبَارُ بِهِ وَتَكَلَّفَ مَا لَا عِلْمَ لَهُ بِهِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ).

واتە: ئەوەی لێیانەوە ڕیوایەتکراوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گوتمان، بێگومان لەخۆیانەوە بەبێ زانست قسەیان نەکردووە، هەرکەسێك دەربارەی قورئان بە ڕەئی خۆی قسە بکات ئەوە تەکلیفی لە خۆی کردووە لە شتێکدا کە زانستی نییە لەبارەیەوە، ڕێگایەکی گرتووەتە پێش فەرمانی پێنەکراوە، ئەگەر مانای ڕاستیش بپێکێت ئەوە هەڵەی کردووە؛ چونکە لە دەرگای خۆیەوە نەچووەتە ژوورەوە وەك ئەوەی کەسێك حوکم بکات لە نێوان خەڵکدا بە نەفامی ئەوە لە ئاگردایە، ئەگەر حوکمەکەشی ڕاست بێت لەو پرسەدا؛ بەڵام تاوانی کەمترە لە کەسێك کە هەڵە بکات و خوا زاناترە.

بەوشێوە خوا ﷻ ئەوانەی کەسانی داوێنپاك تۆمەتبار دەکەن بە زینا ناوی درۆزنی لێناون و دەفەرموێت: ئەگەر چوار شاهید نەهێنن ئەو کەسانە لای خوا درۆزنن، ئەو کەسەی داوێنپاك تۆمەتبار دەکات درۆزنە، ئەگەر کەسێکیش تۆمەتبار بکات زینایشی

کردبێت؛ چونکە باسی شتێکی کردووە حەڵاڵ نییە بۆی باسی بکات و تەکلیفی لە خۆی کردووە لە شتێکدا کە زانستی نییە لەسەری و خوا زاناترە.

(وَلِهَذَا تَحَرَّجَ جَمَاعَةٌ مِنْ السَّلَفِ عَنْ تَفْسِيرِ مَا لَا عِلْمَ لَهُمْ بِهِ؛ كَمَا رَوَى شُعْبَةُ عَنْ سُلَيْمَانَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُرَّةَ عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ: أَيُّ أَرْضٍ تُقِلُّنِي وَأَيُّ سَمَاءٍ تُظِلُّنِي إذَا قُلْت فِي كِتَابِ اللَّهِ مَا لَمْ أَعْلَمْ.

وَقَالَ أَبُو عُبَيْدٍ الْقَاسِمُ بْنُ سَلَامٍ: حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ يَزِيدَ عَنْ الْعَوَّامِ بْنِ حوشب عَنْ إبْرَاهِيمَ التيمي أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ سُئِلَ عَنْ قَوْلِهِ: ﴿وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾﴾(عَبَس)، فَقَالَ: أَيُّ سَمَاءٍ تُظِلُّنِي وَأَيُّ أَرْضٍ تُقِلُّنِي إنْ أَنَا قُلْت فِي كِتَابِ اللَّهِ مَا لَا أَعْلَمُ؟ مُنْقَطِعٌ).

واتە: لەبەر ئەوە کۆمەڵێك لە سەلەف هەستیان بە ئیحراجی کردووە لە تەفسیرکردنی ئایەتێك زانستیان نەبێت لەبارەیەوە؛ وەك شوعبە لە سولەیمانەوە لە عبداللەی کوڕی موڕە لە ئەبومەعمەرەوە دەڵێت: ئەبوبەکری صدیق دەڵێت: چی زەوییەك من لەخۆ بگرێت و چی ئاسمانێك سێبەرم بەسەرەوە بکات ئەگەر قسەیەك لە کتێبی خوا بکەم زانستم نەبێت لەبارەیەوە.

و ئەبوعوبەید قاسمی کوڕی سەلام دەڵێت: مەحمودی کوڕی یەزید بۆی گێڕاینەوە لە عەوامی کوڕی حەوشەبەوە لە ئیبراهیمی تەیمییەوە دەڵێت: ئەبوبەکری صدیق پرسیاری لێکراوە لەسەر ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: ﴿وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾﴾، لە وەڵامدا گوتی: چی

زەوییەك من لەخۆ بگرێت و چی ئاسمانێك سێبەرم بەسەرەوە بکات ئەگەر قسەیەك لە کتێبی خوا بکەم زانستم نەبێت؛ ئەمە مونقەتیعە و سەنەدەکەی پچڕانی تێدایە.

(وَقَالَ أَبُو عُبَيْدٍ أَيْضًا حَدَّثَنَا يَزِيدُ عَنْ حميد عَنْ أَنَسٍ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَرَأَ عَلَي الْمِنْبَرِ: ﴿وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ۝٣١﴾، فَقَالَ: هَذِهِ الْفَاكِهَةُ قَدْ عَرَفْنَاهَا فَمَا الْأَبُّ؟ ثُمَّ رَجَعَ إِلَى نَفْسِهِ فَقَالَ: إنَّ هَذَا لَهُوَ التَّكَلُّفُ يَا عُمَرُ.

وَقَالَ عَبْدُ بْنُ حميد حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ عَنْ ثَابِتٍ عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ وَفِي ظَهْرِ قَمِيصِهِ أَرْبَعُ رِقَاعٍ، فَقَرَأَ: ﴿وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ۝٣١﴾، فَقَالَ: مَا الْأَبُّ؟ ثُمَّ قَالَ: إنَّ هَذَا لَهُوَ التَّكَلُّفُ فَمَا عَلَيْك أَنْ لَا تَدْرِيهِ).

واتە: دیسان ئەبوعوبەید دەڵێت: یەزیدی کوڕی حومەید بۆی گێڕاینەوە لە ئەنەسەوە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب لەسەر مینبەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ۝٣١﴾، گوتی: ئەوە میوەیە زانیمان چییە ئەی ﴿أَبًّا﴾ چییە؟ پاشان گەڕایەوە بۆ نەفسی خۆی و گوتی: ئەمە تەکلیفکردنە.

و عەبدی کوڕی حومەید دەڵێت سولەیمانی کوڕی حەرب بۆی گێڕاینەوە دەڵێت: حەمادی کوڕی زەید لە سابتەوە لە ئەنەسەوە دەڵێت: ئێمە لای عومەری کوڕی خەتاب بووین و لە پشتی کراسەکەی چوار پینەی پێوە بوو، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ۝٣١﴾، گوتی: ﴿أَبًّا﴾ چییە؟ پاشان گوتی: ئەمە تەکلیفکردنە هیچت لەسەر نییە ئەگەر نەزانیت چییە.

تەبەری لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ﴿أَبًّا﴾ ئەوەیە زەوی دەیڕوێنێت و ئاژەڵ دەیخوات و مرۆڤ نایخوات؛ ئەلبانی لە (مختصر صحيح الإمام البخاري)دا دەڵێت: عەبدی کوڕی حومەید و ئەبونەعیم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: لای عومەر بووین کراسێکی لەبەردابوو چوار پینەی پێوەبوو، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾﴾ گوتی: دەزانین: ﴿فَٰكِهَةً﴾ چییە، ئەی: ﴿أَبًّا﴾ چییە؟ پاشان گوتی: نەهیمان لێکراوە تەکلیف بکەین؛ ئیبن کەسیر لە تەفسیردا ئەم ئەسەرەی بە صەحیح داناوە، دەڵێت: مەبەستی شێوە و ڕەگەز و خودی ڕووەکەکەیە، ئەگەرنا هەرکەسێك ئەم ئایەتە بخوێنێتەوە دەزانێت لە ڕووەکی زەوییە.

(وَهَذَا كُلُّهُ مَحْمُولٌ عَلَى أَنَّهُمَا رضي الله عنهما إِنَّمَا أَرَادَا اسْتِكْشَافَ عِلْمِ كَيْفِيَّةِ الْأَبِّ وَإِلَّا فَكَوْنُهُ نَبْتًا مِنْ الْأَرْضِ ظَاهِرٌ لَا يُجْهَلُ؛ لقوله تَعَالَى: ﴿فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ﴿٢٨﴾ وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ﴿٣٠﴾﴾(عَبَس).
وَقَالَ ابْنُ جَرِيرٍ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ عَنْ أَيُّوبَ عَنْ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ: أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ سُئِلَ عَنْ آيَةٍ، لَوْ سُئِلَ عَنْهَا بَعْضُكُمْ لَقَالَ فِيهَا فَأَبَى أَنْ يَقُولَ فِيهَا؛ إسْنَادُهُ صَحِيحٌ).

واتە: هەموو ئەمە بەوشێوەیە لێکدانەوەی بۆ دەکرێت کە ئەبوبەکر و عومەر رضي الله عنهما مەبەستیان ئەوە بووە چۆنییەتی ﴿أَبًّا﴾ بزانن، ئەگەرنا ئەوەی ڕووەکێکە لەسەر زەوی

ئاشكرایە و نەزانراو نییە؛ لەبەر ئەو ئایەتەی كە دەفەرمویت: دەغڵودان و هەموو جۆرە تۆویكمان لیوە ڕوواندووە، داری ڕەز و گژوگیا و لەوەڕمان لەسەر ڕوواندووە، زەیتون و داری خورمامان لەسەر چاندووە، باخ و درەختی گەورەی چڕوپڕمان لەسەر بەدیهیناوە.

و ئیبن جەریر دەڵیت: یەعقوبی كوڕی ئیبراهیم بۆی گیڕاینەوە دەڵیت: ئیبن عولەیە بۆی گیڕاینەوە لە ئەیوبەوە لە ئیبن ئەبومولەیكەوە دەڵیت: ئیبن عەباس پرسیاری ئایەتیكی لیكرا، ئەگەر پرسیار لە هەندیّ لە ئیوە كرابا قسەی لەبارەوە دەكرد، بەڵام ئیبن عەباس هیچی لەبارەیەوە نەگووت؛ سەنەدەكەی صەحیحە.

(وَقَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: حَدَّثَنَا إسْمَاعِيلُ بْنُ إبْرَاهِيمَ عَنْ أَيُّوبَ عَنْ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ: ﴿يَوۡمٍ كَانَ مِقۡدَارُهُۥٓ أَلۡفَ سَنَةٖ ۝٥﴾(السَّجْدَة)، فَقَالَ لَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ فَمَا: ﴿يَوۡمٍ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ ۝٤﴾(المَعَارِج)؟، فَقَالَ الرَّجُلُ: إنَّمَا سَأَلْتُك لِتُحَدِّثَنِي، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: هُمَا يَوْمَانِ ذَكَرَهُمَا اللَّهُ فِي كِتَابِهِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِهِمَا؛ فَكَرِهَ أَنْ يَقُولَ فِي كِتَابِ اللَّهِ مَا لَا يَعْلَمُ).

و ئەبوعوبەید دەڵیت: ئیبراهیمی كوڕی ئیسماعیل بۆی گیڕاینەوە لە ئەیوبەوە لە ئیبن ئەبومولەیكەوە دەڵیت: كەسیك پرسیاری ئەم ئایەتەی لە ئیبن عەباس كرد: لە ڕۆژیكدا كە ماوەكەی هەزار ساڵ دریژە، ئیبن عەباس پیی گوت: لە ڕۆژیكدا كە ماوەكەی پەنجا هەزار ساڵ دریژە، چییە؟ ئەو كەسە گوتی: من پرسیارم لیكردیت بۆ ئەوەی وەڵام بدەیتەوە و باسم بۆ بكەیت، ئیبن عەباس گوتی: ئەوە دوو ڕۆژن خوا لە كتیبەكەیدا باسیكردوون خوا زاناترە بەو دوو ڕۆژە؛ پیی ناخۆش بوو شتیك دەربارەی كتیبەكەی خوا بڵیت كە نایزانیت.

﴿تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ ٤﴾(المَعَارِج).

واتە: فریشتە و جبریل بەرزدەبنەوە بۆ لای، لە ڕۆژێكدا كە ماوەكەی پەنجا هەزار ساڵ درێژە.

﴿فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ﴾ ماوەی بەرزبوونەوەی بۆ لای خوا لەو ڕۆژەدا، بۆ دروستكراوەكانی تر پەنجا هەزار ساڵە؛ ئیبن ئەبوحاتەم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی كردووە و ئیبن كەسیر بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ﴿فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ﴾ ڕۆژی قیامەتە؛ تەبەری لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: ﴿تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ ٤﴾ ئەمە ڕۆژی قیامەتە، خوا كردوویەتییە پەنجا هەزار ساڵ لەسەر بێباوەڕان؛ هەندێكی تر لە ڕاڤەكاران بۆچوونێكی تریان لە لێكدانەوەی ﴿ٱلرُّوحُ﴾ و ﴿خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ﴾ كردووە، بۆچوونیان وایە ئەوە لە دونیایە، سەعدی دەڵێت: ڕۆح ناوی ڕەگەزە و هەموو ڕۆحەكان دەگرێتەوە، باش و خراپیان، ئەمە لە كاتی مردندایە، چاكەكاران ڕۆحەكانیان بەرز دەبێتەوە بۆ لای خوا، ئاسمان بە ئاسمان ڕوخسەتی پێدەدرێت، بەڵام ڕۆحی خراپەكاران ئەگەر گەیشتە ئاسمان داوای ڕوخسەت دەكات ڕوخسەتی پێنادرێت و دەگەڕێنرێتەوە بۆ سەر زەوی، پاشان دەڵێت: ئەو نێوانەی كە فریشتەكان و ڕۆحەكان دەیبڕن بەهۆی هۆكارەكانەوە بە یەك ڕۆژ، ئەو نێوانە بە ڕۆیشتنی ئاسایی پەنجا هەزار ساڵە؛ شەنقیتی باسی ئەم ئایەتە و ئەو ئایەتەی سورەتی الحج دەكات لە كتێبی (دَفَعُ إيهامِ

الاضْطِرابِ عَنْ آياتِ الكِتابِ) کە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ يَوۡمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلۡفِ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾﴾(الحَجّ)، دەڵێت: ئەم ئایەتانە بە دوو شێوە کۆ دەکرێنەوە، یەکەم: ئیبن ئەبوحاتەم لە ڕێگای سیماکەوە لە عیکرمەوە لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ڕۆژە هەزار ساڵەکەی سورەتی الحج یەکێکە لەو ڕۆژانەی خوا ئاسمانەکان و زەوی تێدا دروستکردووە، ڕۆژە هەزار ساڵەکەی سورەتی السجدە ماوەی دابەزینی فەرمان و بەرز بوونەوەیەتی، ڕۆژە پەنجا هەزار ساڵەکە ڕۆژی قیامەتە؛ دووەم: مەبەست لە هەمووی ڕۆژی قیامەتە، جیاوازییەکە بە ئیعتباری حاڵی باوەڕدار و بێباوەڕە، بەڵگە لەسەر ئەمە ئەو ئایەتەیە کە خوا دەفەرموێت: ﴿فَذَٰلِكَ يَوۡمَئِذٖ يَوۡمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ غَيۡرُ يَسِيرٖ ﴿١٠﴾﴾(المُدَّثِّر)، و ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿يَقُولُ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوۡمٌ عَسِرٞ ﴿٨﴾﴾(القَمَر).

(وَقَالَ ابْنُ جَرِيرٍ: حَدَّثَنِي يَعْقُوبُ يَعْنِي ابْنَ إِبْرَاهِيمَ حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ عَنْ مَهْدِيِّ بْنِ مَيْمُونٍ عَنْ الْوَلِيدِ بْنِ مُسْلِمٍ قَالَ: جَاءَ طَلْقُ بْنُ حَبِيبٍ إلَي جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ فَسَأَلَهُ عَنْ آيَةٍ مِنْ الْقُرْآنِ؛ فَقَالَ: أُحَرِّجُ عَلَيْك إنْ كُنْت مُسْلِمًا لَمَا قُمْت عَنِّي أَوْ قَالَ: أَنْ تُجَالِسَنِي).

واتە: ئیبن جەریر دەڵێت: یەعقوبی کوڕی ئیبراهیم بۆی گێڕامەوە ئیبن عولەییە بۆی گێڕاینەوە لە مەهدی کوڕی مەیمونەوە لە وەلیدی کوڕی موسلمەوە دەڵێت: تەڵقی کوڕی حەبیب هات بۆ لای جوندبی کوڕی عبدالله پرسیاری ئایەتێکی قورئانی لێکرد، گوتی:

حەرامی دەکەم لەسەرت ئەگەر موسڵمانی لای من هەستە و برۆ، یان گوتی: ئەگەر لەگەڵم دابنیشیت.

(وَقَالَ مَالِكٌ عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: أَنَّهُ كَانَ إِذَا سُئِلَ عَنْ تَفْسِيرِ آيَةٍ مِنْ الْقُرْآنِ قَالَ: إِنَّا لَا نَقُولُ فِي الْقُرْآنِ شَيْئًا.
وَقَالَ اللَّيْثُ عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: إِنَّهُ كَانَ لَا يَتَكَلَّمُ إِلَّا فِي الْمَعْلُومِ مِنْ الْقُرْآنِ.
وَقَالَ شُعْبَةُ عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ عَنْ آيَةٍ مِنْ الْقُرْآنِ فَقَالَ: لَا تَسْأَلْنِي عَنْ الْقُرْآنِ، وَسَلْ مَنْ يَزْعُمُ أَنَّهُ لَا يَخْفَى عَلَيْهِ مِنْهُ شَيْءٌ يَعْنِي عِكْرِمَةَ.
وَقَالَ ابْنُ شوذب: حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنُ أَبِي يَزِيدَ قَالَ: كُنَّا نَسْأَلُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ عَنْ الْحَلَالِ وَالْحَرَامِ وَكَانَ أَعْلَمَ النَّاسِ، فَإِذَا سَأَلْنَاهُ عَنْ تَفْسِيرِ آيَةٍ مِنْ الْقُرْآنِ سَكَتَ كَأَنْ لَمْ يَسْمَعْ).

واتە: مالك لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە ڕیوایەتی کردووە: دەربارەی قورئان قسەی نەکردووە جگە لەوەی کە زانراوە.

و شوعبە لە عەمری کوڕی مورەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پیاوێك پرسیاری ئایەتێکی لە سەعیدی کوڕی موسەیەب کرد، گوتی: پرسیاری قورئانم لێ مەکە، پرسیار لەو کەسە بکە بانگەشەی ئەوە دەکات هیچی لە مانای قورئان لێ شاراوە نییە، واتە: عیکرمە.

و ئیبن شەوزەب دەڵێت: یەزیدی کوڕی ئەبویەزید بۆی گێڕامەوە دەڵێت: ئێمە پرسیاری حەڵاڵ و حەراممان لە سەعیدی کوڕی موسەیەب دەکرد، لەو کەسانە بوو لەو بوارەدا زۆر

شارەزابوو، ئەگەر پرسیاری تەفسیری ئایەتێکمان لێ بکردایە بێدەنگ دەبوو وەك ئەوەی نەیبیستبێت.

(وَقَالَ ابْنُ جَرِيرٍ: حَدَّثَنِي أَحْمَد بْنُ عبدة الضبي حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ قَالَ: لَقَدْ أَدْرَكْت فُقَهَاءَ الْمَدِينَةِ وَإِنَّهُمْ لَيُعَظِّمُونَ الْقَوْلَ فِي التَّفْسِيرِ، مِنْهُمْ سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، وَالْقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ، وَسَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، وَنَافِعٌ).

واتە: ئیبن جەریر دەڵێت: ئەحمەدی کوڕی عەبدەی زەبی بۆی گێڕامەوە حەمادی کوڕی یەزید بۆی گێڕاینەوە عوبەیداللەی کوڕی عومەر بۆی گێڕاینەوە دەڵێت: گەیشتمە فەقیهەکانی مەدینە قسەکردنیان لە تەفسیر بەگەورە دەزانی، لەوانە سالمی کوڕی عبدالله، قاسمی کوڕی محمد، سەعیدی کوڕی موسەیەب، و نافع.

(وَقَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ صَالِحٍ عَنْ اللَّيْثِ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ قَالَ: مَا سَمِعْت أَبِي تَأَوَّلَ آيَةً مِنْ كِتَابِ اللَّهِ قَطُّ.

وَقَالَ أَيُّوبُ وَابْنُ عَوْنٍ وَهِشَامٌ الدستوائي عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سيرين قَالَ سَأَلْت عُبَيْدَةَ السلماني عَنْ آيَةٍ مِنْ الْقُرْآنِ فَقَالَ: ذَهَبَ الَّذِينَ كَانُوا يَعْلَمُونَ فِيمَا أُنْزِلَ مِنْ الْقُرْآنِ فَاتَّقِ اللَّهَ وَعَلَيْك بِالسَّدَادِ.

وَقَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: حَدَّثَنَا مُعَاذٌ عَنْ ابْنِ عَوْنٍ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ مُسْلِمِ بْنِ يَسَارٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: إذَا حَدَّثْت عَنْ اللَّهِ فَقِفْ حَتَّى تَنْظُرَ مَا قَبْلَهُ وَمَا بَعْدَهُ.

حَدَّثَنَا هشيم عَنْ مُغِيرَةَ عَنْ إبْرَاهِيمَ قَالَ: كَانَ أَصْحَابُنَا يَتَّقُونَ التَّفْسِيرَ وَيَهَابُونَهُ.

وَقَالَ شُعْبَةُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي السَّفَرِ قَالَ: قَالَ الشَّعْبِيُّ: وَاَللَّهِ مَا مِنْ آيَةٍ إلَّا وَقَدْ سَأَلْت عَنْهَا وَلَكِنَّهَا الرِّوَايَةُ عَنْ اللَّهِ.
وَقَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: حَدَّثَنَا هشيم أَنْبَأَنَا عُمَرُ بْنُ أَبِي زَائِدَةَ عَنْ الشَّعْبِيِّ عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: اتَّقُوا التَّفْسِيرَ فَإِنَّمَا هُوَ الرِّوَايَةُ عَنْ اللَّهِ).

واتە: ئەبوعوبەید دەڵێت: عبداللەی کوڕی صالح بۆی گێڕاینەوە لە لەیسەوە لە هیشامی کوڕی عورووەوە دەڵێت: نەمبیستووە باوکم هەرگیز لێکدانەوە بۆ ئایەتێك لە قورئان بکات.

و ئەیوب و ئیبن عەون و هیشامی دوستوائی لە محمدی کوڕی سیرینەوە دەڵێت: پرسیارم لە عوبەیدە سەلمانی کرد دەربارەی ئایەتێك لە قورئان، گوتی: ئەو کەسانە ڕۆیشتن کە دەیانزانی قورئان لەچی بارەیەکەوە دابەزیوە، بۆیە لە خوا بترسە و هەوڵی پێکانی حەق بدە.

و ئەبوعوبەید دەڵێت: موعاز بۆی گێڕاینەوە لە عەونەوە لە عوبەیداللەی کوڕی موسلمی کوڕی یەسارەوە لە باوکییەوە دەڵێت: ئەگەر شتێکت لە عبداللەوە گێڕایەوە بوەستە هەتاکو سەیری پێش و پاشی نەکەیت.

هوشەیم بۆی گێڕاینەوە لە موغیرەوە لە ئیبراهیمەوە دەڵێت: هاوەڵانمان خۆیان لە تەفسیر دەپاراست و لێی دەترسان.

و شوعبە دەڵێت: لە عبداللەی کوڕی ئەبوسەفەرەوە دەڵێت: شەعبی دەڵێت: سوێن بە خوا هیچ ئایەتێك نییە ئیللا پرسیارم دەربارەی کردووە، بەڵام ئەوە گێڕانەوەیە لە خواوە.

و ئەبوعوبەید دەڵێت: هوشەیم بۆی گێڕاینەوە عومەری کوڕی ئەبوزائدە هەواڵی پێداین لە شەعبییەوە لە مەسروقەوە دەڵێت: خۆتان لە تەفسیرکردن بپارێزن چونکە ئەوە ڕیوایەتکردنە لە خواوە.

(فَهَذِهِ الْآثَارُ الصَّحِيحَةُ وَمَا شَاكَلَهَا عَنْ أَئِمَّةِ السَّلَفِ مَحْمُولَةٌ عَلَي تَحَرُّجِهِمْ عَنْ الْكَلَامِ فِي التَّفْسِيرِ بِمَا لَا عِلْمَ لَهُمْ بِهِ، فَأَمَّا مَنْ تَكَلَّمَ بِمَا يَعْلَمُ مِنْ ذَلِكَ لُغَةً وَشَرْعًا فَلَا حَرَجَ عَلَيْهِ؛ وَلِهَذَا رُوِيَ عَنْ هَؤُلَاءِ وَغَيْرِهِمْ أَقْوَالٌ فِي التَّفْسِيرِ وَلَا مُنَافَاةَ؛ لِأَنَّهُمْ تَكَلَّمُوا فِيمَا عَلِمُوهُ وَسَكَتُوا عَمَّا جَهِلُوهُ، وَهَذَا هُوَ الْوَاجِبُ عَلَي كُلِّ أَحَدٍ فَإِنَّهُ كَمَا يَجِبُ السُّكُوتُ عَمَّا لَا عِلْمَ لَهُ بِهِ فَكَذَلِكَ يَجِبُ الْقَوْلُ فِيمَا سُئِلَ عَنْهُ مِمَّا يَعْلَمُهُ؛ لقوله تعالى: ﴿لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ ١٨٧﴾(آلِ عِمْرَان)، وَلِمَا جَاءَ فِي الْحَدِيثِ الْمَرْوِيِّ مِنْ طُرُقٍ: ((مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ فَكَتَمَهُ أُلْجِمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ))[1].

وَقَالَ ابْنُ جَرِيرٍ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ حَدَّثَنَا مُؤَمَّلٌ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ أَبِي الزِّنَادِ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: التَّفْسِيرُ عَلَي أَرْبَعَةِ أَوْجُهٍ: وَجْهٌ تَعْرِفُهُ الْعَرَبُ مِنْ كَلَامِهَا، وَتَفْسِيرٌ لَا يُعْذَرُ أَحَدٌ بِجَهَالَتِهِ، وَتَفْسِيرٌ يَعْلَمُهُ الْعُلَمَاءُ، وَتَفْسِيرٌ لَا يَعْلَمُهُ إلَّا اللَّهُ؛ وَاَللَّهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى أَعْلَمُ).

واتە: ئەم ئەسەرە صەحیحانە و هاوشێوەکانی لە پێشەواکانی سەلەفەوە بەوە لێکدانەوەی دەکرێت پێیان ناخۆشبووە تەفسیری ئەو ئایەتانە بکەن زانستیان نەبووبێت

---

(١). أخرجه أحمد وأبو داود والترمذي وابن ماجه وصححه الألباني.

لەبارەیەوە، بەڵام ئەگەر کەسێك قسە بکات لەسەر تەفسیر بەوەی دەیزانێت لە زمان و لە شەرعەوە حەلاڵە بۆی حەرەجی لەسەر نییە؛ لەبەر ئەوە لەو کەسانە و جگە لەوانیشەوە تەفسیر نەقڵکراوە و قسەکانیان پێچەوانە نییە؛ چونکە لە شتێك قسەیان کردووە کە زانستیان هەبووە دەربارەی و بێدەنگ بوون لەوەی نەیانزانیوە؛ ئەمەش واجبە لەسەر هەموو کەسێك وەك چۆن پێویستە بێدەنگی هەڵبژێردرێت لەئاست هەموو شتێك کە زانست نەبێت لەبارەیەوە، بەوشێوەیەش واجبە وەڵامی ئەوە بدرێتەوە کە دەیزانێت ئەگەر پرسیاری لێکرا؛ بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ڕوونی بکەنەوە بۆ خەڵك و نەیشارنەوە ئەوەی خوا دابیەزاندووە؛ و بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کەلە چەند ڕێگەیەکەوە ڕیوایەتکراوە و دەفەرموێت: هەرکەسێك پرسیارێکی لێ بکرێت دەربارەی زانستێك و بیشارێتەوە لەغاو دەکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا بە لەغاوێك لە ئاگر.

و ئیبن جەریر دەڵێت: محمدی کوڕی بەشار بۆی گێڕاینەوە موئەمەل بۆی گێڕاینەوە سوفیان بۆی گێڕاینەوە لە ئەبوزینادەوە دەڵێت: ئیبن عەباس دەڵێت: تەفسیر چوار شێوەیە: شێوەیەك عەرەب لە ڕێگای زمانیانەوە دەیزانن، و تەفسیرێك کەس بیانووی نییە نەیزانێت، و تەفسیرێك زانایان دەیزانن، و تەفسیرێك کەس نایزانێت جگە لە خوا؛ خوا ﷻ زاناترە.

